دیبەیتا سالێ

# سیکولاریزم و دیموکراسی د ئەزموونا کوردستانێدا



نڤیسینا

عەلی باپیر



وەرگێڕان

صلاح حاجی - جیهاد عبدالبدیع

چاپا دوویێ

٢٠١٩ز - ١٤٤٠م

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net



دیبەیتا سالێ

# سیکولاریزم و دیموکراسی
# د
# ئەزموونا کوردستانێدا



دیبەیتا سالێ

# سیکولاریزم و دیموکراسی
# د
# ئەزموونا کوردستانێدا

نڤیسین


عەلی باپیر


وەرگێڕان

صلاح حاجی – جیهاد عبدالبدیع


چاپا دوویێ

١٤٤٠م/ ٢٠١٩ز

# دیەیتا سالێ

## سیکولاریزم و دیموکراسی د ئەزموونا کوردستانێدا

نڤیسین: عەلی باپیر
وەرگێڕان: صلاح حاجی - جیهاد عبدالبدیع
خەتێ بەرگی: نەوزاد کویی
نەخشەساز: جمعە صدیق کاکە
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
چاپا دوویێ ١٤٤٠م/ ٢٠١٩ز

ل ڕێڤەبەریا گشتی یا پەرتووکخانەیێن گشتی / هەرێما کوردستانێ
ژمارەیا سپاردنێ (٤٥٦) یا سالا ٢٠١٦ پێ هاتیە دان

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥ ﴾

سُورَةُ النَّحۡلِ

## پێشكێش بیت

ب هەر كەسەكی، كو چ تشتەك: نە خو مەزنەكرن، نە بەرژەوەندیەكا تایبەت، نە قەناعەت ئینان ژبەری هزركرنێ، نەشێت لبەرامبەر وەرگرتنا حەقیێدا، ژبو وی ببیتە ئاستەنگ و ڕێگر.


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

# پێشەکیا
# چاپا زاراڤێ بادینی

الحمدلله رب العالمین، والصلاة والسلام على المبعوث رحمة للعالمین، نبـي الله الخاتم ورسـوله الأعظـم ونـوره الأتم، وآلـه أجمعـین، مـن الصـحب والأزواج والقرابة والتابعین لهم بإحسانٍ الى یوم الدین.

دەمێ من گوهـ لێ بوو کو برایێن بەرێز (صلاح حاجی و جیهاد عبدالبـدیع) ئەڤ پەرتووکە ژ زاراڤێ سورانی وەرگێڕای ژبو زاراڤێ بـادینی، گەلـەك دلشـاد بـووم، چـونکی ب لێبورینڤـە مللـەتێ کـورد، ژ ئەگـەرێ نـەبوونا کیانـەکێ سـەربەخو، خـودانێ زمانـەکێ ئـەدەبییێ ئێکگرتـی نینـە، و پـەرتووك و بەرهەمێن بەندەی ژی، ژبلی وان بێن من ب زمانی عەرەبی نڤیسین، یـان ژبـو عـەرەبی "و زمـانێن: فارسـی و تـورکی و ئینگلیـزی ژی" هاتینـە وەرگێـڕان، هەمی ب زاراڤێ سوڕانی هاتینە نڤیسین، و ئـەو کەسـێن ب زاراڤـێ بـادینی و کرمانجی پەرتووکان دخوینن و دئاخڤن، کێمتر ژێ تێدگەهن.

هیڤیدارم ئەڤ پەرتووکە ئەگەرێ بەرچاڤ ڕوونیا خواندەڤانێن وێ بیت، لدور ڕادەیێ تەبەنیکرن و پێگیریـی کـرن ب دیموکراسـیێ و سـیکولاریزمێ، ژلایـێ وان حزب و ڕێکخراوێن خو ب سیکولاریست دزانـن و خـو ب دیمـوکرات زانـێن هەرێما کوردستانێ، و ئەوێن ژ دەرڤەی هەرێما کوردستانێ ژی.

هەروەسا لدور هەلویستێ ئیسلامێ ل بەرامبەر دیموکراسیێ و سیکولاریزمێ، کا چەوا هەڵسەنگاندنێ ژبو دکەت، و چەند نرخ و بەهایەکی ژبو وان دادنێت، و ل کیڤە دگەهنە ئێك، و د چ دا ژێ جودا دبن؟!

دەست خوشیەکا گەرم ل برایێن وەرگێڕ دکەم، خودێ خێرا وان بنڤیسیت و نموونەیێن وەکی وان زێدەبن، و د خێرێدا بەردەوام و خوڕاگر و موکوم بن.

عەلی باپیر
٢١/ێ ڕەبیعا ئێکێ/١٤٤٠م
٢٠١٨/١١/٢٩ز
هەولێر

# بناڤێ خودایێ مەزن و دلوڤان

## پێشگوتن

پشتی نەمانا خەلافەتا ئیسلامی و ڤەمرینا خەتیرە و ڕوناهیا حوکمێ ئیسلامێ لسەر ئاستێ وەلات و حوکمەتان، و جهـ گرتنا وێ ژلایێ وان بەرنامە و سیستەم و میکانزم و ڕێك و ئایینێن مروڤی ب دەستێ خو ئینداینە د هەبوونێدا، و زالبوونا وان لسەر جیهانێ، و پەیدابوون و سەرهلدانا وان ل کوردستانێ، و کاریگەربوونا کومەلگەها مە ب گشتی و تەخا گەنجان ب تایبەتی، ب وان بەرنامە و سیستەمێن ڕوژئاڤا ژبو برێڤەبرنا ژیان و ڕێکخستنا سیستەمێ حکومڕانییێ ژبو واقعێ خو دانایین، مینا (سیکولاریزم) و (دیموکراسی)، د ئەڤی سەروبەریدا مە هەردوو وەرگێڕان، ب فەر و پێدڤی دیت ڕابین ب وەرگێڕانا ئەڤێ پەرتووکا لبەر دەستێ تە، یا ماموستا و زانایێ کورد و سەردەم (علی باپیر)، ژ زاراڤێ سوڕانی ژبو زاراڤێ بادینی، پێخەمەت پتر تێگەهشتن ژ ئەڤان بابەتێن سەردەمیانە و بەربەلاڤ د واقعێ ئەم تێدا دژین.

هەژی گوتنێ یە ژێدەرێ ناڤەڕوکا ئەڤێ پەرتووکێ ژ دیبەیتەکێ هاتیە، کو هاتبوو ڕێکخستن ل ڕێکەفتی ٢٠١٦/٤/١٠ ل بازێڕێ سلێمانییێ، دناڤبەرا ماموستا علی باپیر و کاك مەلا بەختیاری، لدور بابەتێ (سیکولاریزم و دیموکراسی د ئەزموونا کوردستانێدا).

**بەرێزان !**

ژبو نیاسینا هەر هزر و تیور و رێبازەکێ شێوەیێ پەیدابوون و سەهلدانا وێ یا گرنگە، سیکولاریزم ئەو رێبازا سیاسی یا بناڤ جڤاکی، و دیموکراسیەت ژی ئەو سیستەمێ دەستهەلاتداریا مللەتی، دوو زاراڤێن ژێك جودانە، ئەڤ پەرتووکا لبەر دەستێ تە کورتیەکە ژ راستی و واقعێ هەر ئێك ژ سیکولاریزم و دیموکراسییێ ب گشتی و ب تایبەت د هەرێما کوردستانێدا، و دیارکرنا وان ڤەشارتی و درویشمێن کار ژبو نەهاتیە کرن ژلایێ دویکەفتیێن وان، هەروەسا کا هەلویستێ ئیسلامێ لسەر ئەڤان هەردوو تێگەهان چییە ؟ و ئەرێ ئیسلام و (سیکولاریزم و دیموکراسی) د کیش خالێدا ژ ئێك نێزیك دبن، و د کیش خالێدا ژ ئێك دویر دکەڤن.

ژ خودێ دخوازین مە پتر شارەزا و زانا بکەت د ئایینێ مە یێ پیروز و مەزندا، دا کو بکەینە بناغە و بنەمایێ سیستەم و بەرنامەیێ رێکخستنا ژیانا خو، دا ب ئەڤان سیستەمێن مروڤی ب دەستێ خو ئینایە د هەبوونێدا، سەردانەچین، و ژبەر چاڤتارپاتیا مە د ئایینێ مە دا، ب چاڤەکێ مەزن بەرێ خو نەدەینە وان سیستەم و بەرنامەیێن د ئاستێ ئیسلامێ دا د هەژار و لاواز، و ژ ئایینێ خو ب گومان نەکەڤین، چونکی بێگومان لاوازی و کێم شارەزاییا مە د ئایینێ مە دا، دبیتە ئەگەر کو باطل لدەف مە، مەزن و شرین ببیت، د دەمەکی دا باطل هەردەم یێ کێم و بچویك و پویچە !

صلاح حاجی

جیهاد عبدالبدیع

# دەستپێك و
# پێناسەیا ئەڤێ پەرتووكێ

**خواندەڤانێ بەڕێز!**

پشتی كو ل ئێڤارا ڕوژا: ١٠/٤/٢٠١٦ز، ل هولا (تەوار) ل بازێڕێ سلێمانیێ، دناڤبەرا بەندە و كاك مەلا بەختارى دا، دیبەیت (مناظرة)یەك هاتە ئەنجامدان، ژلایێ بەڕێزان:

١- پڕوفیسور میشێل ڤیڤوركا: سەروكێ خانەیا زانستێن مروڤی ل پاریس، و سەروكێ كولیژا جیهانی ژبو ڤەكولینان.

٢- د.عادل باخەوان: ماموستا ل زانكویا ئیڤریی، و ڤەكولەرێ هاریكار ل قوتابخانەیا خواندنا بلند یا زانستێن جڤاكی ل پاریس، هاتە سەرپەرشتی كرن.

دەقێ دیبەیتێ ژی ل كەنالێ تایبەتیێ بەندەی ل یوتیوب، د ئەڤی لینكی دا هەیە: ( https://youtu.be/I0nv7kpBGX4)

پاشان خەلكەكێ زور داخواز كر، كو دەقێ گوتنێن بەندەی، چ گوتنێن گوتارا من، چ بەرسڤێن پرسیارێن كاك مەلا بەختیاری، ب نڤیسین لبەردەست هەبن.

هەر ژبەر ئەڤێ چەندێ پشتی نڤیسینا دەقێ گوتنان ژلایێ هندەك برایێن دلسوز، من ژی دەستەك پێدا ئینا و پێداچوون ژبو كر، وئەڤە بەرهەمێ لبەر دەستێ تە ژێ دەركەفت.

**ئەڤجا د ڤێرێدا پێدڤیە چەند تشتەكان ڕوون بكەین:**

١- دەقێ وان گوتنێن د بابەتیدا، و لـدەمێ بەرسـڤدانا پسـیاران هـاتین، مـە وەكی خو هێلاینە، و هندەك تشت ژی كو د وی دەستنڤیسێ من بەرهەڤكری هەبوون، ژبەر نەبوونا دەمی نەگەهشتم هەمیان بێژم، لڤێرێ مـن زێدەكرینـە، كو ژلایێ ناڤەڕوكێڤە گوهـوڕینێ لسـەر گـوتنێن دیبەتێـدا نـائینن، بتنێ ئـەوا هەی دێ تێروژكەكا زێدەتر دەنە لسەر بابەتی.

٢- هنـدەك دەقـێن قورئـان و سـوننەتێ، كـو وەكـی بەلگەهــ ئینـان لسـەر گوتنان، ل دەمێ دیبەیتێ نەگەهشتم بدەمە دیاركرن، دێ زێدە كەین.

٣- دێ ئاماژەییێ ب هندەك ژێدەر و ناڤێ هندەك زانایان كەین، كـو د دەقـێ بابەتیدا، مە دەلیڤەیا گوتنا وان نەبوو.

٤- ب پێـدڤی نەهاتــە زانـین، دەقـێ هــەمی گـوتن و پرسـیارێن كـاك مــەلا بەختیاری بدەینە دیاركرن، چونكی بـارا پتریـا وان دویـر بـوون ژ چوارچـوڤێ بابـەت (موضـوع)یێ، كـو بەحسـێ {سـیكولاریزم و دیموكراسـی د ئـەزموونا كوردستانێدا} بوو، ئانكو: بتنێ مـە ئـەو گـوتن و پرسـیارێن وی ئینداینـە كـو جهێ مەرەمێ بن.

٥- چەند گوتنێن كاك مەلا بەختیاری، كو دپێـنچ دەقـەیێن دوماهییێـدا كـرن، یان ژبەری هینگی كربوون، و دەلیڤـەیا بەرسـڤدانا وان نـەبوو، دێ ب كـورتی بەرسڤەكێ لسەر دەین.

٦- ژبو بەرچاڤ ڕوونیا خواندەڤانان لسەر میكانزم و شێوازێ برێڤەچوونا وێ دیبەیتێ، ب باش دزانم، دەقێ وێ نامەیا كـو ژبـەری هەیڤـەكێ پـتر ژ دەمـێ دیبەیتێ، ژلاییێ هەردوو ڕێڤەبەر و سەرپەرشـتیارێ دیبەیتێڤـە، گەهشـتیەمن، بدەمە دیاركرن.

٧- تاكـه تێبينــى و ســەرنجەك ژى، كـو ب پێـدڤى دزانم لســەر شـێوازێ برێڤەبرنا دیبەتێ بدەمە دیارکرن، ئەوە کو دەمەکێ کێم (نیڤ دەمژمێر) ژبـو دیارکرنا دوو بابەتێن کو چەند ئاخفتنێن دویـر و درێـژ بخوڤـە دگـرن و چـەند چەق ژێ دچن، کو سیکولاریزم و دیموکراسی یە، هاتبوو دانان، ب دیتنـا مـن ئەگەر بتنێ ئێك بابەت با، دا باشتر یا گونجای بیت ماڤێ بابەتی بهێتە دان.

**ب پێدڤی ژی دزانم، سوپاسی و دەستخوشی و پێـزانینێن خـو ئاراسـتەی ئەڤان کەسایەتی و لایەنێن ل خوارێ بکەم:**

١- کاك مەلا بەختیار کو ئامادەبوو پێکڤە وێ دیبەیتێ ئەنجام بدەین.

٢- پرۆفیسور میشێل ڤیڤورکـا و دکتـور عـادل باخـەوان، کـو ئـەو دیبـەت ب سەرکەفتیانە برێڤەبر.

٣- کەناڵێ ڕووداو،کـو سپونسـەریا دیبـەیتێ کـر، و ڕاسـتەوخو و پیشـەییانە ڤەگوهاست.

٤- هــەردوو کــەناڵێن (پــەیام) و (کوردســات) ئــەوان ژی ژبلــی (ڕووداو)، ڕاستەوخو ڤەگوهاست.

٥- هــەمی تەماشــەڤان و گوهــدارێن بــەڕێز، کــو دنــاڤ هــەرێمێ و ژدەرڤــە: تەماشەڤان و گوهدارێن ئاخفتن و بابەتێ مە بوون.

و ب دیتنــا مــن ئــەم وەکــی مللــەتێ کوردســتانێ ((ل هــەمی جهــێن کوردستانێ: باکوور، باشوور، ڕوژهەلات، ڕوژئاڤـا)) د ئـەڤان سـەروبەراندا، ژ هەر دەمەکی پتر مە پێدڤی ب ئاخفتنا دگەل ئێك و ژئێك تێگەهشـتنێ هەیە، کو بێگومان بێی هەبوونا ئـەڤێ چـەندێ، پێکڤـە هاریکـاریکرن و دەسـتگرتنا هەڤدوو و کارێ پێکڤەیی و ب کوم، بساناهی نابیت.

دوماهيا ئەڤێ دەستپێك و پێناسەيێ ژى، دێ ب ئەڤان چەند ئاخفتنان ئينم "پشتى كورتكرنا وان" كو هەشت (٨) سالا ژبەرى نوكە، ل (٧ێ كانونا دوويێ ٢٠٠٨ز) ل دەستپێكا پەرتووكا: (تەوژمى ئيسلاميى وعەلمانيى و خالێ هاوبەش و جياوازەكانيان)دا، د چاپا ئێكێدا من نڤيسيە:[1] {ئيسلاميى و عەلمانيێن كوردستانێ، دگەل جياوازيێن مەزن و گرنگێن دناڤبەرا ئايين و بەرنامەيێن وان دا، لێ گەلەك ئارمانجێن مەزن و گرنگێن هەڤبەش ژى هەنە، ئەگەر وان بڤێت لسەر بناغەيێ تەبايى و پێكڤە ژيان و خزمەتێ ژبو مللەت و وەلاتى، پێكڤە هاريكار و پشتەڤان بن، بو نموونە:

١- پاراستن و دەستەبەركرنا مافێن رەوايێن خەلكێ كوردستانێ..

٢- پێشڤەبرنا زانست و گەشەپێدانا ئاستێ خواندنێ...

٣- ئاڤەدانكرنا وەلاتى و دروستكرنا ژێرخانا ئابوورى...

٤- چەسپاندنا دادگەريێ، و چارەسەركرنا دياردەيا مەترسيدارا (هندەك پێ بمرن و هندەك ژبو بمرن) و چينايەتيێ.

٥- خوشكرنا ژين و ژيارا خەلكى ژ هەمى لايانڤە.

٦- پاراستنا خێزانێ و بساناهيكرنا پروسەيا پێك ئينانا هەڤژينيێ...

٧- پشتەڤانيكرن ل نەهەرفينا رەوشت و بهايێن بلند، ب تايبەتى دناڤ تەخا گەنجان دا...}.

٢٣/ رجب /١٤٣٧ م
٢٠١٦/٤/٣٠ ز



(١) بەرێ خو بدە: چاپا سێيێ سالا ٢٠٠٨ ز، لاپەرێ ١٥ و ١٦.

## ئەو نامەیا نەخشەیێ ڕێكا
## بڕێڤەچوونا دیبەیتێ بخووڤە گرتی

**چوارچـوڤەكێ بابەتیانـە ژبـو دیبەیتـەكا زانسـتی لـدور دیموكراسـیێ و علمانییەتێ ل كوردستانێ.**

ل دەسـتپێكێ مـە پـێ خوشـە ب سوپاسـیا هـەر ئێـك ژ هـەوەیێن بـەڕێز دەست پێ بكەین، كو هەوە ب ئیجابی بەرسڤا ئەڤێ پێشنیارێ دایی، و ئەڤە ژی بەلگەهە لسەر دلسوزیا هەوە ژبو پرسا پێكڤە ژیان و ئاشـتیا جڤـاكی، ب جیاوازییێن مەڤە ل كوردستانێ.

**بەڕێزان!** د بیست وپێنج سالێن بووریدا، هەرێما كوردستانێ هەردەم جهێ چەندین بیردوز و دژە بیردوزان بوویە، لسەر هـەردوو پرسـێن دیموكراسـیێ و علمانییەتێ دناڤ ئەڤێ دیروكێدا، دوو لایـەن ژێـك جـودا كرینـە، لایەنـەك وەك لایـەنگر و خەباتكـەر پێخەمـەت بدەسـتڤەئینانا كومەلگەهـەكا دیمـوكرات و علمانییـدا، و لایەنـەكێ دی وەك دوژمنـەكێ دژوارێ كومەلگـەها دیمـوكرات و علمانی، د دەمەكی دا واقعێ سیاسییێ كوردستانێ گەلەك ژ ئـەڤێ چـەندێ ئالۆزترە، كو بڤـی ڕەنگـێ بسـاناهی بهێتـە خوانـدن و بڤـێ سـادەهیێ بهێتـە دابەشكرن، ئەڤ جورە ژ دابەشكرنێ، نەكو هەر ڕەنگڤەدانا واقعێ كـونكریتیێ ژیانا ڕوژانەیا ئەكتەرێن سیاسییێن كوردستانێ نینـە، بـەلكو دیتنـا وی واقعـی بخو ژی ب ڕەنگەكی تێكددەت، كو ئێدی سەرەداڤێن وێ ب دەستێن كەس ژ مە ناكەڤیت.

ژڤێریێ: ئەم ژ قوتابخانەیا خواندنا بلند یا زانستێن جڤاکیێن پاریس و خانەیا زانستێن مروڤایەتییێن پاریس، ژبو لادانا وان پەردەیێن، کو لسەر وی واقعێ کونکریتیدا هاتینە دانان، دێ دیبەتەکێ دناڤبەرا هەردوو بەرێزان کاك "مەلا" بەختیار و "ماموستا" عەلی باپیر ی دا بەرهەڤکەین و ئەنجام دەین (ناڤێن وان لدیڤ رێزبەندیا ئەلیف و بێ هاتینە دانان، و چ پەیوەندیەك ب پێگەها سیاسی و ژیێ وان ڤە نینە)، دبیست وپێنج سالێن بوریدا، هەر ئێك ژڤان هەردوو ئەکتەران، نەکو هەر گەلەك بەرهەم لسەر هەر ئێك ژڤان هەردوو تێگەهان بەرهەم ئینانە، نەکو هەر دناڤ دوو پێگەهێن سیاسییێن بلند دانە، بەلکو کاریگەریەکا ڕاستەوخو لسەر کومەلگەها کوردستانێ دانایە، ولدەف چەندین ئەکتەرێن جڤاکی و سیاسی وەکی "ژێدەرێ موبیلیزاسیون/تبعئـة" دهێنە وێنەکرن.

دویر ژ دەنگە دەنگێ لسەر شاشەیێن تەلەفزیونان، و دویر ژ "موزایەدە"یێن سیاسی، دویر ژ هاندان و دەست قوتان و هوتافان، ئارمانجا ئێکێ یا ئەڤێ چالاکیێ بریتیە ژ دروستکرنا چوارچوڤەیەکێ بابەتیانە، بێلایەنانە، ئەکادیمیانەیا دیبەیتێ دناڤبەرا ئەڤان هەردوو ئەکتەراندا، کو بەشەکێ زور ژ ژیانا خو ژبو کارێ "تەنزیر" لسەر دیموکراسیێ و علمانییەتێ تەرخانکریە.

برێکا ئەڤێ دیبەیتێ، ئەم دێ پێکولا کەین ڕوناهیێ بدەینە لسەر وان هێلێن تیوریی، کو ئەڤان هەردوو ئەکتەران، کو بڕیارە نوینەرایەتیا دوو دونیایێن سیاسی و جڤاکیێن ژێك جودا بکەن، ژێك جودا دکەن، هەروەسا ئەم دێ پێکولا کەین ڕوناهیێ بدەینە لسەر وان پران، کو ئەڤان هەردوو دونیایان پێکڤە گرێددەن.

# چەوانیا برێڤەبرنا دیبەیتێ

بەروار: (١٠)ێ (٤)ێ ٢٠١٦.
جهـ: هولا تەوار.
دەمژمێر: (٤)ێ پشتی نیڤرو.

جەماوەر دشێت بەرهەڤ بیت، لێ مافێ پشکداریکرنێ نابیت، کەنالێ دشێن دیبەیتێ بڤەگوهێزن، لێ مافێ پشکداریکرنێ نابیت، بەرێز ماموستا عەلی باپیر ل لایێ راستێ دێ روینتە خوارێ و بەرێز کاك بەختیار ل لایێ چەپێ. هەروەسا پروفیسور میشێل ڤیڤورکا سەروکێ خانەیا زانستێن مروڤییێن پاریس و ئەز، دێ دناڤبەرا ئەڤان هەردوو بەرێزاندا بین، و پێکڤە دێ ئیدارەیا دیبەیتێ کەین.

بەرێزان باپیر / بەختیار هەر ئێك ژوان ژبو ماوەیێ بیست وپێنج (٢٥) خولەکان دێ بابەتێ خو لسەر دیموکراسیێ و علمانییەتێ پێشکێش کەن، پشتی هەردوو بدوماهی دهێن هەر ئێك ژوان پازدە (١٥) خولەك هەنە ژبو گەنگەشەکرنا بیردوزێن ئەوێ دیتر، پشتی هینگی پروفیسور میشێل ڤیڤورکا دێ گەنگەشەیا بیردوزێن هەردوو بەرێزان کەت ژبو ماوەیێ بیست و پێنج (٢٥) خولەکان و هەر ئێك ژ پشکداران ژی (١٥) خولەك هەنە ژبو بەرسڤدانێ، سەرجەمێ ماوەیێ دیبەیتێ دێ بیتە سەد و پێنجی (١٥٠) خولەك.
زمانێ بکارئینانێ بریتیە ژ کوردی و ئینگلیزی.

پڕوفیسور میشێل ڤیڤورکا: سەروکێ خانەیا زانستێن مروڤیێن پاریس، سەروکێ کولیژا جیهانی ژبو ڤەکولینان.

دکتور عادل باخەوان: ماموستا ل زانکویا ئیڤری، و ڤەکولەرێ هاریکار ل قوتابخانەیا خواندنا بلند یا زانستێن جڤاکیێن پاریس.

# ڕێ خوشكرن

**خواندەڤانێ بەڕێز!**

**بەحس و بابەتێن ئەڤێ پەرتووكێ، ب ئەڤی شێوەی هاتینە دانان:**

بەشێ ئێكێ: سیكولاریزم *(Secularism)*

بەشێ دوویێ: دیموكراسی *(Democracy)*

بەشێ سێیێ: ئەنجامێن: سیكولاریزم و دیموكراسیێ د ئەزموونا هەرێما كوردستانێدا.

بەشێ چوارێ: بەرسڤدانا پرسیاران.

دیارە بەشێن ئێكێ و دوویێ و سێیێ، د دەقێ وی بابەتی دا هەبوون، كو من پێشكێش كری، بەشێ چوارێ ژی بریتیە ژ بەرسڤدان و ڕوونكرنێن من لسەر ئاخفتنێت كاك مەلا بەختیاری.

بەشێ پێنجێ: بەرسڤا چەند ئاخفتنەكان، كو د دیبەیتێ دا نەگەهشتم بەرسڤا وان بدەم.

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمدلله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله،
محمد وآله المهتدين بهداه

لدەستپێکێ بخێرهاتنا هەمییان دکەم، ژ خویشك و برایان، چ ئەوێن دناڤ هولێدا، چ ئەوێن ژدەرڤە، و هەمی ئەوێن گوهێ وان ل ئاخفتنێت مە، و مە دبینن ل هەرێما کوردستانێ، و ژ دەرڤەی هەرێما کوردستانێ، و گەلەك سوپاسیا هەردوو بەرێزان: پرۆفیسور میشێل ڤیڤورکا، و دکتور عادل باخەوانی دکەم، کو ئەڤ دیبەیتە گێڕای، و سوپاسیا کاك مەلا بەختیاری ژی دکەم، کو ئامادەبوونا خو دیارکری، دا ئەم پێکڤە ئەڤێ گەنگەشێ و دیبەیتێ ئەنجام بدەین.

**بەرێزان!** ژبەری بهێمە سەر پێشکێش کرنا بابەتێ خو، من دڤێت چوار تێبینیێن کورت بدەمە دیارکرن:

١- دێ پێکولا کەم گەلەك ب بابەتیانە باخڤم، ب چ ڕەنگەکی تشتێ دوبارە نەئێخمە دناڤ بابەت و ئاخفتنێت خو دا.

٢- نەچارم ژبەر کورتیا دەمی، گەلەك ب کڤاشتی و کورت و پوخت بابەتی پێشکێش بکەم، هوین ژی هەمی خواندەڤان و ڕەوشەنبیرن، ب تشتەکێ کێم، گەلەك تێدگەهن، لەوما مەتنێ وێ دێ بێژم، و شرۆڤەکرنا وێ دێ کەمە خەما هەوە!

٣- دێ پێكولا كەم ب ئەڤى لايى و ب وى لايى دا نەچم، بەلكو لسەر ئەو دوو بابەتێن هاتينە ديارکرن: بەحسێ (سيكولاريزم و"سيكولاريزەيشن" دگەل ديموكراسى)ێ باخڤم، و بەرەڤ ئەڤى لايى و ئەوى لايدا ناچم، چونكى بەحس و بابەت گەلەكن، و ئەگەر بهێت و هەر تەڤرەكى ل نهالەكێ بدەين، ژێ خلاس نابين.

٤- ئەرێ ئەڤ دييەيتە يا پێدڤى بوو، يان نە؟ وەكى كاك عادلى ژى بەحس كرى، هاتيە گوتن: "كو مە نوكە قەيرانا ئابوورى هەيە، و شەڕێ داعشێ هەيە، و كومەكا ئاستەنگ و ئاريشەيان هەنە، كو بەرسينگێ هەرێما مە گرتينە، ئەڤجا ئەڤە هەمى ڕاستە، بەلێ لەوما ئەڤ دييەيتە يا پێدڤيە؟ "ب بوچوونامن" كو ئەو سيكۆلاريزما د وەلاتێ مە دا، مە گوتيە[1] جێبەجێ دكەين، و بانگەشەيا پێگیربونێ ژبوو دكەين، و ئەو ديموكراسييەتا كو ئەم بانگەشەيێ ژبو دكەين، ب بوچوونامن: ئەم دگەل چ ژ وان هەردوويان ڕاست نەبووينە، لەوما ئەڤ واقعێ مە هيڤى ژبو نەخواستى ژێ پەيدابوويە.

ئەڤجا: دجهێ خودايە ئەم لدور وێ چەندێ گەنگەشەيێ بكەين، دا كو بزانين سيكولاريزم چييە و چەوايە؟ و ديموكراسى چييە و چەوايە؟ و ئەز دێ ئەڤى بابەتى لسەر سێ بەشاندا دابەش كەم:

**د بەشێ ئێكێ دا: د سێ تەوەراندا، دێ بەحسێ سيكولاريزمێ كەم:**

تەوەرێ ئێكێ: پێناسەيا سيكولاريزم و سيكولاريزەيشن.

تەوەرێ دوويێ: سەرهاتيا سەرهلدانا سيكولاريزمێ ل ڕوژئاڤا.

تەوەرێ سێيێ: كومەلگەهەك كو ژ ئيسلامێ تێگەهشتبيت، چ بەهانايەك ژبو هەبوونا سيكولاريزمێ نينە.

---

(١) ئانكو: حزبێن سيكولاريست وەگوتيە.

**د بەشێ دوویێ دا: د سێ تەوەراندا، دێ بەحسێ دیموکراسیێ کەم:**

تەوەرێ ئێکێ: پێناسەیا دیموکراسیێ.

تەوەرێ دوویێ: سەرهاتی و چیروکا دیموکراسیێ.

تەوەرێ سێیێ: جیاوازی دناڤبەرا سیکولاریزم و دیموکراسیێ د واقعێ هەرێما کوردستانێدا.

**د بەشێ سێیێ دا دێ ڕابم ب دیارکرنا ئەنجامان، ئەرێ: سیکولاریزم و دیموکراسی د ئەزموونا حوکمڕانیا هەرێما کوردستانێدا چەوانە؟!**

دێ پێکولێ کەم ئەو دەمێ دەستنیشانکری کو (نیڤ دەمژمێر)ە، لسەر هەر سێ بەشان دابەش بکەم.

## تەوەرێ ئێكێ:

## پێناسە

دێ هێمە لسەر پێناسەیا سیكولاریزمێ، تێگەهێ سیكولاریزمێ، لدویڤ وان ژێدەرێن كو من دیتین، پتر ژ سەد پێناسەیان من د وێ بواریدا دیتینە، بەلێ باشترین پێناسەیا كو ب دلێ من، ئەوە یا ئینسكلۆپیدیا بریتانی (دائرة المعارف البريطانية) ئینای، كو دبێژیت:

{(Secularism) سیكولاریزم: ڤەلڤینەكا جڤاكیە، دڤێت خەلكی ژ گرنگی دانا ب ڕوژا دوماهیێ لابدەت، و ڕوویێ وان بزڤڕینیت بەرەڤ گرنگیدانا بتنێ ژبو ژیانا دونیایێ، ئەڤە ژی ژبەر وێ چەندێ، كو خەلك د سەدەیێ ناڤەڕاستدا "ئانكو: خەلكێ ئەوروپا" ڤیانەكا دژوار هەبوو ژبو پشت دانا دونیایێ، و هزركرنا خودێ و ڕوژا دوماهیێ، ئەڤجا ژبو بەرسینگگرتنا وێ حەز و ڤیانێ، سیكولاریزمێ د خیلالێ گەشەپێدانا مروڤیدا، خو دا دیاركرن، و خەلك د چەرخێ ڕێنیسانسێدا، گرێدانا خو یا بهێز ب بەرهەم و دەستكەفتیێن مروڤیڤە، نیشاندا، و قەناعەت پەیدا كر، كو دگونجیت هیڤیێن خو د ئەڤێ ژیانا دونیایێ دا بجھ بینن، ئێدی ڕوویێ خو دا سیكولاریزمێ ب ئەڤی جورەی، د سەرجەمێ دیروكا نوی دا، د گەشەكرنێ دا بوو، وەكی بزاڤەكا لدژی ئایینی و لدژی مەسیحییەتێ}[1].

---

(١) دائرة المعارف البريطانية، ج١٠، ص٥٩٤.

ب دیتنا من کورتترین پێناسە ژبو سیکولاریزمێ ئەڤەیە: کو (کلود جفری) ئینایە، دبێژیت: (سیکولاریزم: بریتیە ژ لادانا هەر مەرجەعەکێ ئایینی) هەروەسا (جول فیری) (١٨٣٢-١٨٩٣) کو وی ژی پێناسەیەکا کورت ئینایە، دبێژیت: (سیکولاریزم: بریتیە ژ رێکخستنا کومەلگەهێ بێی خودێ).

و دگونجیت بێژین: (سیکولاریزم: بریتیە ژ ب سەنتەرگرتنا مروڤی، و پشت گوهـ هاڤێتنا خودێ).

ئەز ژی دبێژم: (سیکولاریزم: ئایینەکێ ئەردیێ دەستێ مروڤیە، ژبو گرتنا جهێ ئایینێ ئەسمانی یێ خودێ). [1]

**ئەڤجا پێدڤیە لدور سیکولاریزمێ، ئەڤان چوار مەسەلان ژی بزانین:**

١- ئێکەم کەس، کو ژبو ئێکەم جار پەیڤا سیکولاریزمێ بکارئینای (جورج جەیکوب هولایوك) بوو، کو ل سالا (١٨٥٤)ێ نامیلکەیەك نڤیسی بناڤێ (سیکولاریزما ئینگلیزی).

---

[1] دگونجیت ژبو پتر بەرچاڤ روونیێ لدور تێگەهـ و رامانا پەیڤا (*Secularism*)ێ، بەرێخودان ژبو ئەڤان ژێدەران بهێتە کرن:

١- معجم اللغة البريطانية (١١٣٨/٣١).

٢- معجم أكسفور، ٨٤٩ - ٨٥٠.

٣- معجم ويبستر، ٢٠٥٣.

٤- دائرة المعارف البريطانية (١٠/ ٥٩٤).

٥- دائرة معارف الدين والأخلاق (٩/ ٥١١).

٦- الموسوعة الميسرة في الفكر الفلسفي والإجتماعي، ٢٧٣، د كميل الحاج.

٧- الموسوعة العربية (١٣/ ٤٢٣ - ٤٢٥).

٨- قاموس المصطلحات السياسية والدستورية، ٢٤٤، د. أحمد سعيفان.

٩- موسوعة السياسة (٤/ ١٧٩ - ١٨٠)، د. عبدالوهاب الكيالي

٢- سیكولاریستان هەم كەسێن خودێ نیاس دناڤدا هەنە، و هەم كەسێن خودێ نەنیاس ژی، ب دیتنا من ئەم گەلەك لسەر ئەڤی بابەتی نەچین باشترە، بەلێ سیكولاریستان هەردوو لایەن تێدا هەنە، بو نموونە: (جورج هولایوك) (١٨١٧-١٩٠٦) خودێ نیاس بوویە، بەلێ (چارلس برالوّو) (١٨٣٣-١٨٩٤) كەسەكێ مولحد بوویە، د پەرتووكەكێدا كو ل سالا (١٨٩٦) نڤیسیە، دبێژیت: دەرئەنجامێ لوژیكی ژبو وەرگرتنا سیكولاریزمێ، بریتیە ژ ئیلحادێ، و ئەڤ (چارلس برادلوّو)ە، د دەمێ خو دا پشتی (جورج هولایوك)ی بەرپرسێ (كومەلا سیكولاریستێن بریتانیا) بوویە[1].

٣- دیارە سیكولاریزم (Secularism) یا هەی، وەك بیروكە، و سیكولاریزەیشن (*Secularization*) یا هەی، وەكی پراكتیزەكرن و جێبەجێكرن، ئانكو: (علمانییەت) و (عەلمەنە).

٤- سیكولاریزما گشتگیر یا هەی، ئانكو سیكولاریزما سەخت و دژوار، كو دڤێت هەمی تشتەكی بێختە دبن هەیمەنەت و هەژموونا خوڤە، و سیكولاریزما بەشی (جزئی) یا هەی، یان سیكولاریزما نەرم، كو ب هندێ ئیكتیفایێ دكەت، كو دەولەت و ئایین ژ ئێك جودا بن، بەلێ نەڤێت بچیتە دناڤ هەمی جومگەیاندا، و نەڤێت ببیتە بەدیل ژبو هەمی تشتەكی.

---

(١) هەلبەت (خودێ نیاس) و (باوەردار "مؤمن") ژ ئێك جودانە، هەر باوەردارەك خودێ نیاسە، بەلێ مەرج نینە هەر خودێ نیاسەك باوەردار بیت، بو نموونە: ئبلیس خودێ دنیاسیت، بەلێ باوەری پێ نینە، چونكی بناغەیێ سەرەكیێ ئیمان و كاكلكا وێ، بریتیە ژ حەژێكرن و قەبویلكرن و تەسلیم بوونا دل و دەروونی، هەروەكی د بەرگێ ئێكێ یێ پەرتووكا (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی ...) مە روون كریە.

**کورتیا بوچوونا من لدور پێناسە و ماهییەتا سیکولاریزمێ:**

ب دیتنا من سیکولاریزم ب گشتی، یان دبێژیت: خودێ (سبحانه وتعالی) هەبوون ژبو نینە، و ئایین ڕاست نینە، یان ژی دبێژیت: خودێ ئەگەر هەبیت ژی، ئەو ماف نینە دەستێ خو بکەتە دناڤ کاروبار و ژیان و ژیارا مروڤی!!

بەلێ دیارە کیش خودێ (سبحانه وتعالی)، و کیش ئایین؟ ئەو خودایێ، کو ئەرستوی دگوت: خودێ بونەوەر وەکی دەمژمێرەکێ بکارئێخستیە و پشتا خو دایێ، نەکو ئەو خودایێ ئیسلام پێناسە دکەت، کو هەردەم یێ دگەل بەندەیێن خو و پشتا خو نەدایێ، و ئاییێ پڕ ئەفسانەیێن کەنیسێ، نەکو ئەو ئاییێ، کو هەردەم دگەل ڕێچەیا ژیانێ دا دچیت، کو ئیسلامە، بەلکو ئەو ئاییێ کو ڕێگر بوو، ژ پێشکەفتن و ژ ئازادیا عەقلی.

## تەوەرێ دوویێ :

## سەرهاتیا سەرهلدانا سیکولاریزمێ د ڕۆژئاڤا (غرب)ێ دا

هەلبەت ئەو سەرهاتی، سەرهاتییەکا گەلەك دویر و درێژە، ئەگەر حەز لسەر هەبیت کو حەقێ وێ بهێتە دان، و ب تێر و درێژی لسەر باخڤین[1]، بەلێ مە لڤێرێ ئەو دەم نینە، لەوما ب کورتی و کرمانجی دێ بێژین:

خودایێ بلند و مەزن (عزوجل) هەر لدەستپێکا جهـ نشینکرنا باب و دەیکا مروڤایەتیێ (ئادەم و حەووا) لسەر ئەردی، گوتە وان کو ئەو دێ ڕێنماییێ (هدایة) ژبو وان هنێریت، داکو ئەو بەر پیێن خۆ ببینن، و بزانن چەوا بژین و برێڤە بچن، هەروەکی خودایێ مەزن کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ ﴾ طـه.

ئانکو: "خودێ" کەرەم کر و گوت: هوین هەردوو {ئادەم و حەووا، ئبلیس} هەرنە خوارێ {ژ ئەسمانی یان بەهەشتێ} هندەك ژ هەوە دوژمنێن هندەك ژ هەوەنە، ئەڤجا هەر دەمەکی ڕێنمایی ژ دەف من ژبو هەوە هاتن، هەر

---

(١) د پەرتووکا: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) دا من ئەڤ سەرهاتی و چیروکە ڤەگێڕایە، ژ هەژی گوتنێ یە: ئەو پەرتووك ژبو هەر ئێك ژ زمانێن: عەرەبی و فارسی و تورکی ژی هاتیە وەرگێڕان.

کەسێ دویڤچوونا ڕێنماییێن من بکەت، چ جاران نە سەردا دچیت و نە ژیانا وی تالێ دبیت.

ئێدی پێغەمبەرێن خودێ (علیهم السلام) ب خەتیرا ڕێنمایێ و بەرنامەیێ خودێ ڤە، وەکی خەلەکەییێن زنجیرەکێ ئێك لدویڤ ئێکی هاتن، هەروەکی خودایێ مەزن کەرەم دکەت و دبێژیت:

١- ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ.. ﴿٣٦﴾ ﴾ النحل.

ئانکو: و ژ هەر کومەڵگەهەکێ، مە هنارتییەك فرێکریە کو: خودێ بپەرێسن و خو ژ طاغووتان دویر بکەن...

٢- هەروەسا خودایێ کار بنەجهـ کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾ فاطر.

ئانکو: و چ مللەت و کومەك نەبوویە، کو هشیارکەرەك «پێغەمبەرەك» ژبو وان نەهاتبیتە فرێکرن.

هەتاکو د ئەنجامدا عیسایێ کوڕێ مەریەمێ ئەوێ بەرنیاس ب مەسیح "علیه السلام" بوو دوماهیك خەلەکە ژ وێ زنجیرەیا پێغەمبەر و هنارتییان (علیهم السلام)، کو خودایێ زانا و کارزان بتنێ ژبو مللەت و کومەڵگەهـ، و قویناغەکا دیارکری، د ژیانا بەشەری دا هنارتین، ژبەری پێغەمبەرێ دوماهیێ (النبي الخاتم) موحەممەدێ کوڕێ عەبدوڵلاهێ کوڕێ عەبدولموطەلیب "علیه الصلاة والسلام" وەکی دوماهیك پێغەمبەر ژ سەرجەمێ هنارتییێن خو، ب دوماهیك پەرتووك (قرآن)، و دوماهیك پەیام و بەرنامەیێ خو، ژبو هەمی مروڤایەتیێ فرێکەت، ب بەرفرەهیا ئەردی و درێژاهیا زەمانی.

بەلێ، عیسایێ كورێ مەریەمێ ژی وەكی هەمی پێغەمبەرێن دی "ژبلی موحەممەد علیه الصلاة والسلام" بتنێ ژبو مللەت و كومەلگەهەكێ دیاركری هاتبوو هنارتن، كو مللەتێ بەنی ئیسرائیلی بوو، وەكی خودێ كەرەم دكەت و دبێژیت:

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ..﴿٦﴾ ﴾ الصف.

ئانكو: و بینە هزرا خو، دەمێ عیسایێ كورێ مەریەمێ گوتیە مللەتێ خۆ: ئەی دویندەها ئیسرائیل! ئەز هنارتییێ خودێ مە ژبو هەوە، تەوراتا ژبەری خو ب ڕاست دزانم، و مزگینێ ژی ددەمە هەوە ب پێغەمبەرەكی، كو ناڤێ وی ئەحمەدە، پشتی من دێ هێت ..

ئانكو: تشتەكێ سروشتی و چاڤەرێكری بوو، ئەگەر خو پەیام و بەرنامەیێ عیسای (علیه السلام) وەكی خوژی مابایە، و دەستكاری ژی تێدا نەهاتبا كرن، ژیانا مروڤایەتیێ ب گشتی پشتی سەدان سالان ژ هاتنا عیسای پێ برێڤە نەدچوو!

ئەڤجا عیسا و دویكەفتیێن وی ژی بەردەوام ژ لایێ ڕومانیان، ب هاندان و پیلانێن جوهییان، دهاتنە تەپەسەركرن و كوشتن و دەربەدەركرن، هەتا وی دەمێ، كو (قسطنطین) پاشایێ ڕومێ ( ٢٨٠ – ٣٣٧ ز) مەسیحییەتا خو ڕاگەهاند، و د كومبوونا نیقیە (مجمع نیقیة) ل سالا (٣٢٥ ز) دا ب فەرمی پشتەڤانیا سێگوشەیا (ثالوث) ئانكو (الله، الإبن، الروح القدس)، (خودێ، كور، ڕوحا پیروز) كر، دناڤ وان بیروكە و هزر و بیرێن جودا و ناكوكیێن دناڤبەرا نەصرانییاندا، كو ئێك ژ دیروكناسان لدور وێ چەندێ جوان گوتیە:

(تَروَّمَتِ النصرانية، ولم تَتَنَصَّرِ الروم)، ئانكو: نەصرانییەت بوو ڕومانی، و ڕووم نەبوونە نەصرانی!

ئەڤجا پشتی وی دەمێ نەصرانییەتێ دەست ژ ئێکتاپەرستیێ بەردای (النصرانية المتنازلة عن التوحيد) و دەستێ خو ب کورسیا دەستهەلاتێڤە گرت، و دەست ب دامەزراندنا کەنیسێ (کنیسە) کر و چینا زەلامێن ئایینی (ئەکلیرۆس) سەرهلدا، دەستهەلاتا پاپا و قەشەیان زێدەبوو د بیاڤێن سیاسی و ئابوری و جڤاکیڤە، کەنیسە ژ کەڤلێ خۆ دەرکەفت، و د ئەنجامدا ل هەمی وەلاتێن ئەوروپا، سیستەمێ (ثیوکراسی – theocracy) ئانکو حوکمێ خودایی، یان حوکمەتا ئایینی[1] هاتە تەبەنیکرن و بەرنامەیێ ڕاست و ساخێ مەسیحی (عليه السلام) ب تەمامی ڕەنگێ خو یێ دروست ژ دەست دا، هەتا ژ بنەڕەت ژی هاتە گوهورین، و ئایینەکێ دی کو (بولس الرسول) دانا بوو، پاشی پاپایان و "چینا ئەکلیروس" پتر هاڤێتە لسەر و دەستکاری تێدا کر، و جهێ ئایینێ دروست گرت.



(١) ب مخابنیڤە گەلەك ژ علمانیان، نەشێن حوکمەتا ئیسلامی، و حوکمەتا ئایینی ژ ئێك جودا بکەن، د دەمەکی دا دناڤبەرا وان هندی دویراتیا ئەرد و ئاسمانی یە، چونکی حوکمەتا ثیوکراسی، کەسێ حوکمڕان ب پەرستی (إلە)، یان ب نوینەر و سیبەرا خودێ دزانیت بەلێ د ئیسلامێدا حوکمڕان وەکیلێن خەلکی نە، هەروەسا د ئیسلامێ دا بەرپرس پابەندن ب شەریعەتی، بەلێ د سیستەمێ ثیوکراسیدا ئیرادەیا حوکمڕانان ژێدەرێ یاسایێ و .. هتد.

## سەرنجدانەک ژبو ئايينێ كەنيسێ:

نوكە ژى دا سەرنجدانەكا بلەز ژبو وى ئايينێ كەنيسێ بكەين، كا چ بوويە و چەوا بوويە؟! داكو بزانين بوچى خەلكێ ڕوژئاڤا ژ دەستێ وى ئايينى ڕەڤين و هەوارا خو ژبو سيكولاريزمێ بر؟!

ئەم د شەش خالاندا ب كورتى دێ پێكولا دانەنياسينا وى ئايينێ كەنيسێ كەين، كو ب نەحەقى ناڤێ وى كربوو (ئايينێ مەسيحى):

## ١- گوهورين و دەستكاريكرنا پەرتووكا پيروز (الكتاب المقدس):

ديارە مەرەما مە ژ پەرتووكا پيروز (Holy Book) هەر ئێك ژ پەيمانا كەڤن (العهد القديم) و پەيمانا نوى (العهد الجديد)ە، هەر ئێك ژ ئەڤان هەردوو پەرتووكان، گەلەك و گەلەك بێن هاتينە دەستكارى كرن و گوهورين، و هەر كەسێ بخوينيت، چ مەندەهوشى ژبو نامينيت، كا بوچى خەلكێ ڕوژئاڤا، هندى شيابن بێن ژ دەستهەلاتا وى ئايينى ڕەڤين!

ئەڤجا هەلبەت مە لڤێرێ ئەو دەليڤە نينە گەلەك لسەر ئەڤێ چەندێ باخڤين[1]، و بتنێ دێ سێ نموونەيان ژ وان گوتنێن بێ سەروبەر ئەوێن د وێ پەرتووكێدا هاتين، ئينين:

### ئێك: لووط و هەردوو كچێن وى:

د پەيمانا كەڤن[1]، سيفرا تەكوينێ، ئيصحاحا: ١٩ێ دا، هاتيە، كو پشتى پێغەمبەر لووط (عليه السلام) و هەردوو كچێن وى ڕزگار بوين ژ وێ بەلايا

(١) د مەوسوعەيا: (الإسلام كما يتجلي في كتاب الله) د بەرگێ سێيێ دا، كو د چاپا دوويێ دا دبيتە (الكتاب الخامس) من هەلسەنگاندنەكا باش ژبو هەردوو پەرتووكێن: پەيمانا كەڤن، و پەيمانا نوى كريە، و من گەلەك نموونە لسەر خەلەتيێن وان ئينانيە.

لسەر مللەتێ وان دا هاتی، هەردوو کچێن وی "ب هێجەتا ئینانا زاروکان" بابێ خو ب مەشرۆبی سەرخوش دکەن و پاشی ب سرا زینایێ دگەل دکەن.

دوو: داوود و ئوریا:

د پەیمانا کەڤن[2]، سیفرا صەموئیلێ دوویێ، ئیصحاحا: ١١ێ دا، هاتیە، کو دبێژن داوود پێغەمبەر (علیه السلام) د ئێك دەم دا سەد ژن هەبووینە! و بەرێ چاڤێ وی ل هەڤژینا (ئوریا)ی بوویە، تەماعیا خو دبەتێ، و فرێدکەتە لدویڤ، و زینایێ دگەل دکەت، پاشی ئوریایێ هەژینێ وێ فرێدکەتە پێشەهیا شەڕی، هەتا د ئەنجامدا دهێتە کوشتن، و داوود هەڤژینا وی مارە دکەت!

سێ: خو لێکدانا یەعقووبی دگەل خودێ:

هەروەسا د پەیمانا کەڤن[3]، د سیفرا تەکوینێ، ئیصحاحا: ٣٢ێ دا، هاتیە، کو یەعقووبی شەڤەکێ ل جهەکی بناڤێ (فنیئیل) دگەل خودێ دکەڤیتە خو لێکدانێ، هەتا بەری سپێدێ ئێك و دوو ئینان و برن، پاشی خودێ گەها ڕانێ یەعقووبی ژ جهـ بر، و گوتێ: من بەردە، ڕوژ دەرکەفت!

و یەعقووبی ژی گوتێ: هەتا تو بەرەکەتێ نەدەیە من ئەز تە بەرنادەم، د ئەنجامدا خودێ بەرەکەت دایێ.

ب دیتنا من ئەڤ سێ نموونەیە بەسن، ژبو سەلماندنا وێ گوتنا، کو دبێژیت: (پەرتووکا پیروز) ئەوا لدەف جوهی و نەصرانییان چ گومان د

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ١٩، ص٥٢ و ٥٣.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر صموئيل الثاني، الإصحاح: ١١، ص٦٥٩ و ٦٦٠.

(٣) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ١١، ص٨٧، ٨٨.

گوهۆڕین و دەستكاریكرنا وێ دا نینە، و سەدان تشتێن هوسا تێدا هەنە، كو ب چ ڕەنگەكی، چ مرۆڤەكێ خودان عەقل و سروشتێ وی یێ ساخ بیت، وێ چەندێ قەبویل ناكەت و نەشێت بێژیت ئەڤە گوتنا خودێ و وەحیێ و پەیاما خودێ یە!

## ٢- ژ لایێ عەقیدە و هزرێڤە:

ژ لایێ عەقیدە و هزرێڤە، ئاییێ كەنیسێ كومەكا لادان (إنحراف)ێن مەزن مەزن تێدا هاتنەپەیدا كرن، كو ئەڤ حەفتە، ژ خالێن سەرەكی بوون:

١- تەبەنیكرنا فەلسەفەیا ئەرستوی لدور خودێ، كو دگوت: خودێ بونەوەر وەكی دەمژمێر (سەعەت)ەكێ دروست كریە و دایە شولی، و وەسا هێلایە!

٢- تەبەنیكرنا بیروكەیا: سێ پەرستی (تثلیث) كو دبێژیت: (باب و كوڕ و ڕوحا پیروز) (الأب والإبن والروح القدس) خودێ پێك دئینن!

٣- بەشەك و هەتا بناغێ ئاییێ وان، ژ قەلەمدانا بخاچڤەكرنا عیسای، ژبو ژێبرنا گونەهێن دویكەفتییێن وی.

٤- پسوولەیا لێخوشبوونێ (صكوك الغفران) دابەشكرن لسەر خەلكی، كو دگوت پاپا و قەشە نوینەرێن خودێ نە، ژبو لێبوورینا گونەهێن خەلكی.

٥- دروستكرنا چینا ئەكلیرۆس (طبقة الكهنوت) كو بتنێ ژبو وان دروستە بەحسێ ئاییینی بكەن، و پەرتووكا پیروز شرۆڤە بكەن.

٦- پاپا ب سێبەر و نوینەراتیا خودێ دهێتە دانان، پاشان حوكمڕان.

٧- ژ قەلەمدانا هزرێن: ئیقلیدس و بەتلیموس و جالینوس، وەك بەشەك ژ ئاییینی، كو هەلبەت پشتی ئیسباتبوونا خەلەتی و نەدروستیا وان، ئاییێ وان كەنیسان ژی ب گشتی كەفتە دبن نیشانا پرسیارێ!

بو نموونە: دەمێ کو پەرنیکوسی (١٤٧٣–١٥٤٣) سەلماند، کو ئەرد یێ بازنەیی یە و دزڤریت، ڕیسێ کەنیسێ و پاپا و کەهەنووتان دوبارە بوو خوری!

### ٣- دانانا دادگەهێن پشکنینا عەقیدێ (محاكم التفتيش عن العقيدة):

هەر ژ سالا (١١٨٣ ز) کەنیسە و زەلامێن خو، ڕابوون ب دانانا دادگەهێن پشکنین و سانسورکرنا هزرێ و عەقیدێ، و د وی ماوەی دا کو کەنیسێ دەستهەلات هەبوو، دەوروبەرێن سێ سەد هزار (٣٠٠,٠٠٠) کەس هاتنە دادگەهکرن و سزادان، و دەوروبەرێن سیهـ و دوو هزار (٣٢,٠٠٠) کەس بتنێ ب سوتاندنێ هاتنە سزادان، کو دناڤ وان دا هەر ئێك ژ:

١- جیوردانو برنو: ١٥٤٨ – ١٦٠٠ .

٢- جیو فری فالیە: ١٥٧٤ .

٣- بومبو نیو راستنیکو: ١٥٨٧ .

٤- ئیدوارد وایتمان: ١٦١٢ هەبوون.

(گالیلو) ژی ل سالا (١٦٤٢) توبە پێ دا کرن، ئەگەرنە دا ئەو ژی ب دەردێ ئەوێن دیتر چیت!

و (دی روزا) د پەرتووکا (دیروکا ڕەشا کەنیسێ) دا، گوتیە: بتنێ ل ئیسپانیا، سیهـ هزار (٣٠,٠٠٠) کەس هاتنە سوتن!

## ٤- تەبەنيكرنا سيستەمێ ثيوكراسى (theocracy):

ژلايێ كەنيسێ و چينا ئەكليروس ڤە، ل هەمى ئەوروپا سيستەمێ حوكمەتا خودايى يان حوكمەتا ئايينى (ثيوكراسى) هاتە تەبەنيكرن و د ئەنجامدا:

سێگوشەيا شووم (ثالوث مشئوم) ژ:

پاپا، پاشا، دەرەبەگ (البابا، الملك، الإقطاعي) چێبوو، كو دەستەكا خوين مێژ و كابوسەكا بێزاربوون، ژبو گيانێ خەلكى و جەماوەرى.

## ٥- ڤورخكاريەكا دژوار ژبو مولك و سامانى:

كەنيسێ و زەلامێن خو، بەروڤاژى ئەوا بانگەشە ژبو دكر، كو بريتى بوو ژ ژيانا رەبەنايەتيێ (الرهبانية) و پشتدانا دونياييێ، هەمبيزا دونياييێ و پارە و سامانى كربوو، و باجەكا زور بناڤێ خودێ و مەسيح و كەنيسێ، ژ خەلكى وەردگرت.

## ٦- تێكچوونا ئاشتيا جڤاكى:

پشتى كو هەر ئێك ژ ڤەلڤينا: ١- مارتن لوثەر ١٤٨٣ز – ١٥٤٦ ل ئەلمانيا، ٢- ڤەلڤينا كالڤن: ١٥٠٩ – ١٥٤٤ ل فرەنسا، سەرهلداين، وەك كارڤەدانەك ژبو كەنيسێ و دار و دەستێن وێ، شەر و كوشتنەكا بێ سنوور، چەنگێ خو يێ رەش دانا لسەر ئەوروپا، دناڤبەرا هەر سێ رەوتێن:

أ- كاثوليك .

ب- پروتستانت .

ج- ئەرثذوكس .

و د وان شەڕ و كوشتنان دا، كو هەبوون سەد (١٠٠) سالان، و هەبوون سيهـ (٣٠) سالان د بەردەوام بوون، مليونان خەلك هاتينە كوشتن!

**ئێدى د ئەنجامدا:**

١- كەنيسێ عەقل و هشێن هزرڤانان زنجير كر، داكو د ئەنجامێ هزركرنا ئازاد، بيروكەيێن فەلسەفى يێن كەنيسێ ئاشكەرا نەبن!

٢- هەروەسا كەنيسێ دل و دەروونێ خەلكى و جەماوەرى ب ناڤێ چينا كەهەنووتان، گرتبوون و بن ئاخ كربوون!

٣- پاپا و قەشە و چينا ئەكليروس خو ژ خەلكى كربوو سێبەر و وەكيلێن دروستێن خودێ!

٤- ژيان توشى ڕاوەستيانێ ببوو، و دژايەتيا هەر جورە داهێنان و نويكاريەكێ دهاتە كرن.

٥- كەنيسێ هاندانا خەلكى دكر ژبو گوشەگيريێ وپشت دانا دونيايێ، و ژيانا ڕەبەنايەتيێ، هەروەكى خودايێ مەزن كەرەم دكەت و دبێژيت:

﴿... وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ ...﴾ (٢٧) الحديد.

ئانكو: وان لدەڤ خو ڕەبەنايەتيەك دروست كر بوو، كو مە لسەر وان پێدڤى نەكربوو..

٦- و كەنيسە ببوو بەشەك ژ سێگوشەيا سيستەمێ ستەمكاريێ و ثيوكراسيێ (پاپا، پاشا، دەرەبەگ).

## ڕاپەڕینا هزرمەند و پاشى خەلكى و جەمـاوەرى ژ كەنیسـێ و ئاینـێ وێ

ئـەڤجا د ئەنجامـدا ل بەرامبـەرى وان هـەمى خەلـەتى و لادان و تـاوانێن كەنیسـێ، هزرمەنـد و خـەلك و جـەماوەر ژى ب گشـتى، ب تـەمامى بێـزار و خەمگین بوون، دەست هاڤێتە ڤەلڤین و كارڤەدانێن جوراوجور:

**ئێك: مارتن لوثەر ١٤٨٣ – ١٥٤٦:**

دەستپێكێ ل ئەلمانیا (مارتن لوثەر) ڤەلڤینا (پروتستانت)ێ ڕاگەهاند، كو پتر وەكى ڕەخنەگرتنێ ژ كەنیسێ و پشتەڤانیكرنێ ژ ئاییێ ڕاستەقینە یـێ مەسیحى، خو دا دیاركرن.

دشێین ناڤەڕوكا ڤەلڤینا (پروتستانت)ێ د ئەڤان پێنچ بنـەمایان دا كـورت و پوخت بكەین:

١– تاك یێ ئازادە، پەرتووكا پیروز بخوینیت.

٢– كاهن نینە، و نهێنیا پیروز، كو بتنێ چینا ئـەكلیروس بـزانن، هـەبوون ژبو نینە.

٣– ژبو تاكى هەیە ڕاستەوخو خودێ بپەرستیت.

٤– ژدەرڤەى بازنەیێ كەنیسێ ژى ڕێكا دەربـازبوونێ ژ دوزەخـێ و ڕازى كرنا خودێ هەیە.

٥– تێگەهشتنا عەقلانە ژ پەرتووكا پیروز، دروستە و گونەهـ نینە.

**دوو: کالڤن ١٥٠٩ - ١٥٤٤:**

ئەڤی ژی ل فرەنسا ل دژی کەنیسێ و ئەفسانەیێن وێ و تاوان و لادانێن وێ راپەڕین کر، کو دیتنا ئەڤی ژی گەلەک ژ یا (مارتن لوثەر)ی یا نێزیک بوو.

**سێ: شورەشا فرەنسا ( ١٧٨٩ ز ):**

و د ئەنجامدا شورەشا فرەنسا، ل سالا (١٧٨٩ز) هاتە ڕوویدان، کو ئێک ژ دروشمێن وێ ئەڤە بوو:

"دوماهیک پاشا ب ریڤیکێن دوماهیک قەشە ئیعدام بکەن"

ئەڤجا ژ ڤێرێ پێڤە، کو ژبەری هینگی سیکولاریزم (Sesularism) وەکی تیور و بیروکە هەبوو، ڤێجارێ حالەتێ جێبەجێکرن و پراکتیزەکرنێ (تطبیق) بخوڤە دیت، و هاتە گوهوڕین ژیو سیکولاریزەیشن (Secularization) ئانکو: ب علمانیکرن (العلمنة) .

و بیروکەیا سیکولاریزم و حالەتێ سیکولاریزەیشنێ ژی، هەروەکی چەوا ئاگر بەردبیتە پویشی، هوسا بلەز هەمی وەلاتێن ئەوروپی ڤەگرت.

## تەوەرێ سێیێ:
## كومەلگەهەك كو ژ ئیسلامێ تێگەهشتبیت، چ بەهانەیەك ژبو هەبوونا سیكولاریزمێ نینە

**بەڕێزان!**

ئەم د دوو خالان دا ب كورتی، دێ ڕاستیا وێ گوتنا لسەری سەلمینین، كو مە كریە ناڤ و نیشانێ ئەڤی تەوەری:

**خالا ئێكێ: دیروكا ئیسلامێ و موسلمانان، بەروڤاژی دیروكا كەنیسێ و نەصرانیيانە:**

١– عیسا (علیه السلام) ژبو مللەتەكێ تایبەت (بنو إسرائیل) و قویناغەكا دیاركری، هاتبوو، "هەروەكی ژبەری نوكە مە گوتی" بەلێ ئیسلام ژبو هەمی مروڤایەتیێ یا هاتی، هەروەكی خودایێ مەزن كەرەم دكەت و دبێژیت:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٢٨ ﴾ سبأ.

ئانكو: مە تو نەفڕێكری، ئەگەر ژبو هەمی خەلكی، نەبیە ئەو كەس یێ مزگینیێ ددەیە وان، و وان دترسینی ژ عەزابا خودێ.

ئــەڤجا: ئەگــەر ئــايين و بەرنامــەيێ عيســاى (عليــه الســلام) كــو ژيــو كومەلگەهــەكا تايبــەت، دەوروبــەرێن دوو هــزار ســالان ژبــەرى نوكــە هاتبيتــە فرێكرن، نەشێت "ب ساخى و سەلامەتى ژى، پا چەوا پشتى گوهورين و دەستكاريكرنێ" ئاريشــە و ئاستەنگێن كومەلگەهێن لـدويڤ خـو چارەسـەر بكـەت، نـە يـا مەعقوولـە ئيسـلامەكا نـە دەسـتكاريكرى و ئـەوا ژبـو هـەمى مروڤايەتيێ هاتيە فرێكرن، لسەر وى ئايينى بهێتە قياس كرن.

٢- پەرتووكا عيساى (عليه السلام) گەلەك هاتيە دەستكاريكرن و گوهورين، چونكى خودێ ئێك ئينجيل ژبو مەسيحى (عليـه السـلام) يـا فرێكرى، بـەلێ نوكـە چـوار ئينجيـل يێن لبـەر دەسـتێ نەصرانييان (مَتَّـى، يُوحَنَّـا، لُوقَـا، مرْقَصْ)، كو ئەڤە ژى دناڤ دەهان ئينجيلاندا يێن هەلبژارتين.

بـەلێ قورئـان نـەكو پەيڤـەك، بـەلكو پيتـەك ژى نەهاتيـە گوهـورين، و ب فەرمانا خودێ يا پاراستيە، هەروەكى خودايێ مەزن كەرەم دكەت و دبێژيت:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ۝٩ ﴾ الحجر.

ئانكو: مە بخو زكر يێ فرێكريە خوارێ، و ئەم بخو ژى پارێزەرێن وێينە.

لدور گوهورين و دەستكاريكرنا ئايينێ عيسـاى، لسـەر دەسـتێ كەنيسـێ، (جرين برنتن) د پەرتووكا (أفكـار ورجـال)[1] د لاپـەرێ (٢٠٧)ێ دا، دبێـژيت: (بێگومان ئەو مەسيحييەتا زالێ د كومبوونا (نيقيه)دا "٣٣٥" كو كره ئـايينێ مەزنترين ئيمبراتوريەتا دونيايێ، ب تەمامى جودا بوو ژ مەسيحييەتەكێ، كـو مەسيحيێن جەليل "برێڤە دبر").

٣- نەصرانى هەتا دەسـتگرتى بـوون ب ئـايينێ خـو ئـەوێ هاتيـە تێكـدان و دەستكاريكرن، پاشـكەفتى بـوون، دەمـێ دەسـت ژێ بـەردايـن، پێشـكەفتن،

---

(١) هەلبەت ئەو پەرتووك يا هاتيە وەرگێران ژبو زمانێ عەرەبى.

بەلێ موسلمان، بەروڤاژی ئەڤێ چەندێ: هەتا دەستگرتی بوون ب ئایینێ خو ڤە، ل پێشەهیێ بوون، بەلێ ل وی دەمێ دەستێ خو ژ ئیسلامێ سست کری، کەفتنە دوماهییێ.

٤- د دیروکا موسلماناندا خەلەتی و لادان هەبووینە، بەلێ ژ ئەگەرێ لادانا حوکمڕانان بوویە ژ ئیسلام و قورئانێ، بەلێ لادانا نەصرانییان، ژ ئایین و پەرتووکا وان بخوو بوو، ئەوێن هاتینە تێکدان و گوهوڕین.

**خالا دوویێ: چ ژ وان ئەگەرێن کو خەلکێ ڕوژئاڤا ژ کەنیسێ ڤەرەڤاند، د ئیسلامێدا هەبوون ژبو نینە:**

١- ژلاییێ عەقیدێ و هزرێ و زانستێڤە:

١- ژ ئەگەرێ وێ چەندێ کو قورئان یا هاتیە پاراستن ژ هەر گوهوڕینەکێ ژ لایێ خودایێ مەزن و خودان شیانڤە، رێك یا ل لادانا عەقیدێ و هزرێ هاتیە گرتن:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر.

٢- ئێکەمین ئایەتا قورئانێ هاتیە خوارێ ب: بخوینە (إقرأ) دەستپێکر:

﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾ العلق.

و موعجیزەیا پێغەمبەرێ خاتەم صەلات و سلاڤێن خودێ لسەر بن، موعجیزەیەکا هزری و زانستی یە، کو قورئانە.

٣- د ئیسلامێ دا: دین و ژین، حوکم و حیکمەت، سیاسەت و عیبادەت، دونیا و ڕوژا دوماهیێ، یێن دناڤ ئێك دا تێکەل کرین و ئێك ئێکی تەمام دکەت.

٤- ئيسلامىَ ژ لايىَ هەبونناسيىَ (ontology) و عەقيدێڤە، موسڵمان يێن بىَ منەت و دەولەمەند كرين، و ژلايىَ دونيادارييێڤە ژى: دەستىَ وان ڤەكريە، بەلكو لسەر وان پێدڤى كريە، عەقل و هشێن خو ب ئازايانە و ئازادانە بكاربينن، هەر حيكمەت و پێزانينەكا ب مفا ژ لايىَ هەر كەسەكى ڤە هەبيت، وەربگرن:

﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ۚ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر.

ئانكو: ڤێجا تو ئەى پێغەمبەر مزگينيىَ بدە بەندەێن من، ئەوێن گوهىَ خو ددەنە هەمى گوتنان، پاشان دويكەفتنا گوتنا ژ هەميا باشتر و دروستر دكەن، و ئەو ئەون يێن خودىَ رێنمايى كرين، و هەر ئەون يێن خودان عەقل.

٥- قورئانىَ فەرمان ل مروڤى كريە، سەرنجدان و بەرێخودانىَ ژبو ديارده و ديمەنێن سروشتى بكەت، و هزرا خو د نهێنيياندا بكەت:

- ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ ﴾ الطارق.

ئانكو: ڤێجا بلا مروڤ سەرنج و بەرێخودانىَ بكەت، كا ژ چ هاتيە دروستكرن!

- ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ ﴿٢٤﴾ ﴾ عبس.

ئانكو: ڤێجا بلا مروڤ سەرنج و بەرێخودانىَ ژبو خوارنا خو بكەت!

- ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ .. ﴿١٨٥﴾ ﴾ الأعراف.

ئانكو : ئەرىَ ما وان بەرێخودان ژبو ملكىَ بەرفرەهىَ ئەسمان و ئەردى، و هەر چێكريەكىَ ديتر يىَ خودىَ نەكريە ؟!

- ﴿ قُلْ سِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ .. ﴿٢٠﴾ ﴾ العنكبوت.

ئانكو: بێژە: هوین د ئەردی دا هەرن، و بەرێ خو بدەنێ کا (خودێ) چەوا چێکرنا چێکرییێن خو دەست پێ کریە!

٦- زانا و شارەزایان ب گشتی، پلە و رێزەکا تایبەت هەیە، بەلێ چ ماف وئیمتیازەك لسەر خەلکی و جەماوەری نینە، ژ لایێ برێڤەبرن و سەرپەرشتیا کومەلگەهێ:

- ﴿ .. قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ .. ﴿٩﴾ ﴾ الزمر.

ئانكو: بێژە: ئەرێ ئەوێن دزانن و ئەوێن نەزانن، یەکسانن؟!

- ﴿ .. يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ .. ﴿١١﴾ ﴾ المجادلة.

ئانكو: خودێ مەرتەبا وان ئەوێن باوەردار ژ هەوە دێ بلند کەت، و ئەوێن خودێ زانین دایێ ژ هەوە، ب چەندین مەرتەبا دێ وان بلندکەت.

- ﴿ .. إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ .. ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر.

ئانكو : بێگومان هەما بەندەیێن زانا "وەك پێدڤی" ب چاڤەکێ مەزن ژ خودێ دترسن.

٢- ژلایێ ژین و ژیاریڤە:

١- خودایێ بلند و مەزن، د چەندین ئایەتێن قورئانێدا، راگەهاندیە، کو هەر تشتەکێ د هەبوونێدا هەی، ژبو مروڤی بن دەست کرینە:

أ- ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا .. ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة.

ب- ﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾ الرحمن.

ج- ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثية.

٢- هەروەسا خودایێ مەزن ڕاگەهاندیە، کو مروڤ ب مەرەما ئاڤەدانکرنا دونیایێ لسەر ئەردێ هاتیە دانان:

﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ ﴾ هود.

٣- و خودێ پەسنا وان کریە، کو ژبەری چاکیێن ڕوژا دوماهیێ، چاکیێن دونیایێ، ژ خودێ دخوازن:

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾ ﴾ البقرة.

**هەژی گوتنێ یە ژی:** هەمی ئەو ئایەتێن کو زەمکرنا ژیانا دونیایێ تێدایە، ئەگەر سەرنجدان ژبو سیاقا وان بهێتە کرن، دێ هێتە زانین کو مەرەم ژ وێ ژیانا دونیایێ یە، ئەوا خودانێ وێ ب ئەگەرێ وێ، ڕوژا دوماهیێ ژبیر دکەت، بو نموونە:

﴿ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الأنعام.

ئانکو: و ژیانا دونیایێ بتنێ یاری و مژویلاهی نە، جهـ و وارێ ڕوژا دوماهیێ باشترە، ژبو وان یێن خو دپارێزن، ئەرێ ما تێناگەهن؟!

ئەگەرنە، بێگومان خودێ ئەو هەمی پێغەمبەرێن خو فرێکرین، و ئەو هەمی پەرتووکێن خو یێن ئینداینە خوارێ، ژبو باشکرن و ڕێك و پێککرنا ژیانا

دونیایێ یە، هەروەکی دیارە د نێرینا ئیسلامێدا، گەلەك گرنگی و پویتەدان پێ هاتیە دان.

٣- ژلایێ سیاسیڤە:

١- خەلك و کومەلگەهـ ب گشتی، خودانێن ئەصلێ حوکمی و دەستهەلاتا سیاسی و حوکمڕانییێ نە، بەلگەهـ ژی لسەر ئەڤێ چەندێ ئەوە، کو هەمی پەیڤین (خطابات)ێن قورئانێ، بەرێ وان یێ ل خەلکی و کومەلگەهێ ب گشتی، نەکو تەخ و چینەکا تایبەت:

أ- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴿١﴾ ﴾ النساء.

ب- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴿١﴾ ﴾ الحجرات.

و هەتا ژبو ئێك جار ژی خودایێ بلند و مەزن، بەرێ ئاخفتن و پەیڤینێن خو نەداینە، زانایان (علماء) یان بەرپرسان (مسؤلين) یان بناڤ سالڤە چوویان (شیوخ) .. هتد!

٢- مشێورەت (شوری) بناغێ حوکمڕانییێ و بڕێڤەبرنا کاروبارایە، هەروەکی خودایێ عزوجل کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿ ...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ...﴿٣٨﴾ ﴾ الشوري.

ئانکو: و بڕێڤەبرنا کاروبارێن وان (یێن موسلمانان) ب مشێورەتێ یە.

٣- حوکمڕان و بەرپرس وەکیلێن خەلکی و کومەلگەهێ نە، نەکو وەکیلێن خودێ، و ڕەوایەتی و شەرعییەتێ ژ خەلکی وەردگرن، نەکو ژ خودێ، پاشی ل دەمێ بەراوردکرنا سیستەمێ حوکمڕانییێ د ئیسلامێ، و دیموکراسییێ دا، دێ بەحس کەین.

٤– زانا و شەهرەزايان پلە و رێزێن تايبەت هەنە، بەلێ نە چينەكا تايبەت و خودان ماف و ئيمتيازاتێن سياسى نە، وەك چينا ئەكليروس!

و بێگومان د ئيسلامێدا، سەرپەرشتاريەتا مشێورەتێ (ولاية الشورى) هەيە، نەكو سەرپەرشتاريەتا شەرعزانان (ولاية الفقيه)، و ئەڤ جورە ژ حوكمڕانيێ، د سروشتێ ئيسلامێدا يا غەريبە، و دووبارەكرنا ئەزموونا ئايينێ كەنيسێ، و حوكمێ پاپايێن روژئاڤايە ل سەدەيێن ناڤەڕاستدا، و نابيت ئەڤ جورە حوكمڕانيە، كو گەلەك يا نێزيكە ژ حوكمەتا ئايينى و خودايى (ثيوكراسي) لسەر ئيسلامێ بهێتە هەژمارتن، ئەو ئيسلاما پێكهاتى ژ قورئان و سوننەتێ، چونكى هەروەكى ژبەرى نوكە مە گوتى:

د ئيسلامێدا خودانێن ئەصلێ دەستهەلاتێ (صاحب السلطة الأصلي) خەلك و جەماوەرە ب گشتى، هەر لەوانێ ژى خودێ فەرمانێ ل كومەلگەهێ دكەت كو كاروبارێن حوكمڕانيێ و بەرپرسايەتيێ ب كەسێن ژهەژى بسپێرن، هەروەكى كەرەم دكەت و دبێژيت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ...﴿٥٨﴾ ﴾ النساء.

هەروەسا بناغێ حوكمڕانى و كاروبارێن خەلكى و برێڤەبرنا وەلاتى مشێورەتە:

أ- ﴿ ...وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...﴿٣٨﴾ ﴾ الشوري.

ب- ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران.

٤- ژلایێ ئابوریڤە:

دوماهیك پەرتووکا خودێ یا بهێز کو قورئانا پیروزە، گەلەك ب ئاشکەرایی ڕاگەهاندیە، کو خودایێ کار بنەجهـ ئەو ناز و نیعمەت و خێر و بێرێن لسەر ئەردێ، بێ جوداهی ژبو هەمی مروڤان بەرهەڤ و دروست کرینە:

أ- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا .. ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة.

ئانکو: هەر چ تشتەکێ د ئەردی دا، خودێ ژبو هەوە هەمیان دروست کرینە.

ب- ﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾ الرحمن.

ئانکو: و "خودێ" ئەرد ژبو مروڤان دانایە.

ئەڤجا: ژبو چ کەسەکی نینە، قورخکاریێ د خێر و بێرین لسەر ئەردی دا بکەت، و چ کەس و بنەماڵە و ئیجاخ و عەشیرەت و مللەتەك، ژ چ کەس و بنەماڵە و ئیجاخ و عەشیرەت و مللەتەکێ دیتر، پتر پشك و بەهر د خێر و بێرێن لسەر ئەردی دا نینە.

و ب ڕاستی ئیسلامێ: لایەنێن ئەرێنی یێن هەر ئێك ژ (سوسیالیزم) و (کاپیتالیزم) تێدا هەنە و ژ لایەنێن نەرێنی (سلبی) یێن وان یا بەریئە.

٥- ژلایێ جڤاکیڤە:

١- ئیسلام ئایین و بەرنامەیەکە دگەل سروشتی و فیترەتێدا دگونجیت، هەر چ سروشتێ ساخ یێ مروڤ داخواز دکەت، بخوڤە گرتیە، هەروەکی خودایێ زانا کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الروم.

٢- د ئیسلامێدا مروڤ: ب نێر و مێ و ب هەمی ڕەنگ و دەنگ و عەشیرەت و نەتەوەیانڤە، یەکسانن، و باشترینێ وان ئەوە یێ ژ هەمیان بتەقواتر، هەروەکی خودایێ مەزن کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات.

٦- ژلایێ ئێمناهی و پێکڤە ژیانێڤە:

هەردەمێ موسلمان ب شێوەیەکێ ڕاست و دروست، ژ بەرنامەیێ خو تێگەهشتین، و ب باشی پێڤە پێگیر بووین، یێن جوان بوین ب سالوخەتێ بلندێ تەباییێ و پێکڤە ژیانێ (التسامح والتعايش) دبیاڤێ سەرەدەریکرنێ دگەل ئەوێن دی "نە موسلمان" دا، و هەردەم ل دەمارگیرییێ و گرتیاتییێ (التعصب والإغلاق) یێن دویر بووین، چونکی ئاییتێ وان باوەری یا ب گوپیتکا ئازادییێ هەی، د بیاڤێ بیر و باوەر و دەربڕینێدا[1].



(١) د پەرتووکا (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) دا، د چاپا شەشێ، و بەرگێ دوویێ یێ مەوسووعەیا: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)، مە ب درێژاهی بەحسێ وێ مەسەلێ کریە.

# تەوەرێ ئێكێ:

## پێناسە

ديموكراسى (Democracy) ئانكو: دەستهەلاتا مللەتى، ژ هەردوو پەيڤێن يونانى: دەستهەلات (Kratos) و مللەت (Demos) پێكهاتيە، هەروەكى د (موسوعة السياسة) دا هاتيە: (الحكم الذي تكون فيه السلطة للشعب) ج٢، ص٧٥١ .

ئانكو: ئەو سيستەمەيە، كو تێدا دەستهەلات يا خەلكى يە.

**هەلبەت (ديموكراسى) ب گەلەك شێوەيان يا هاتيە پێناسە كرن، بەلێ ئەم دێ حەفت ژ وان ب نموونە ژێ وەرگرين:**

١- (جون ستراوت ميل) دبێژيت: (باشترين جورێ دەستهەلاتێ ئەوە، كو زورترين دەليڤەيا پشكداريا سياسى بينتە د هەبوونێدا، و هەژيترين پەيكەرێ دەستهەلاتێ ژبو كومەلگەها سەردەم، ئەوە كو نوينەراتيا وێ بكەت). بەرێ خو بدە: (حكوومەتى نوێنەرايەتى / ١٨٦١ لاپەرێ ٣١٤) .

٢- (جوزيف شەمپيتەر) دبێژيت: (سيستەمەكێ سياسى يە، كو تێدا كاريدەست بەريكانێ دكەن ژبو گەهشتنا دەستهەلاتێ، برێكا بدەستڤەئينانا دەنگێن خەلكى، و كاريدەستێن سياسى، برێكا هەلبژاردنان دهێنە دياركرن). بەرێ خو بدە: (سەرمايەداريى، سوشياليزم، ديموكراسى / ١٩٤٣ لاپەرێ ٢٦٩).

٣- (ڕوبێرت دال) دبێژیت: (سیستەمێ دیموکراتیك، سیستەمەکە ڕەوایەتیێ ژ خەلکی وەردگریت، و مانا وێ ژی گرێدایە ب بەردەوامیا ڕازیبوونا خەلکی). بەرێ خو بدە: (لە بارەی دیموکراسی یەوە / ١٩٩٦ لاپەڕێ ٨٢).

٤- (کارل پوپەر) دبێژیت: (دیموکراسی سیستەمەکە، کو هاوولاتی تێدا دشێن بێ خوین ڕێتن کاربدەستێن خو بگوهوڕن) ( ١٩٦٢ / لاپەڕێ ١٢٤).

٥- (ئیان شاپیرو) دبێژیت: (دیموکراسی دهێتە خواستن ژبو کومەکا دامودەزگەهان، کو دەلیڤەیێ دروست دکەت، خەلك کاربدەستێن خو دابنێن و لابدەن ژی). (پێگەی دیموکڕاسی ١٩٩٨، لاپەڕێ ٣٥).

٦- (فرانسیس فوکویاما) دبێژیت: (دیموکراسی سێ تشتێن پێدڤی نە: دامودەزگەهـ، سەروەریا یاساییێ، لێپرسین). (سیستەمی سیاسی و ئاژاوەی سیاسی ٢٠٠٥).

٧- (ئیریك فرۆم) دبێژیت: (ل دویڤ سیستەمێ دیموکراسی: هەمی هاوولاتی ژ بەرپرسایەتیا دروستکرنا بڕیارا سیاسی، یەکسانن). ( ٢٠٠٢، لاپەڕێ ١٧٩).

**ئەز ژی دبێژم:**

دشێین بێژین: دیموکراسی ئەو سیستەمەیە، کو خەلکی ماف هەبیت د دانانا حوکمڕانان، و ڕەخنە گرتن ژ وان، و لادانا وان.

## تەوەرێ دوویێ:

## سەرهاتیا دیموکراسیێ

ئەرێ ڕاستە "هەروەکی ب لێبورینڤە لدەڤ پتریا خەلکێ دونیایێ بوویە قەناعەت" کو دیموکراسی " ئانکو: خەلکی شیان بێن هەبن د دانان، و چاڤدێری کرن، و لێپرسین و لادانا حوکمڕانانـدا " سیستەمەکە ژ یونانێ هاتیە، و ژبو جارا ئێکێ ل وێرێ هاتیە جێبەجێکرن، و کالایەکێ ڕوژئاڤا یی ڕویتە ؟!

**د بەرسڤێ دا دبێژین:**

بێگومان ئەو بیروکە نە یا ڕاستە، بەلێ چونکی ڕوژئاڤا خو ب سەنتەر دزانیت، و سەلماندنا ئەڤێ دەعوایێ ژی، ژلایێ گەلەك مللەتانڤە، ئەو وەهمە یا کریە: ڕاستییەکا حاشا هەلنەگر لدەف گەلەك خەلکی!

من سەحکریە گەلەك پەرتووکێن دیروکی، دیار دکەن کو دیموکراسی، (نەکو وەك ناڤێ وێ، بەلکو وەکی ناڤەڕوکا وێ، ئەوە کو خەلك بەرپرسێن خو دابنێن، و ماڤێ چاڤدێریکرنا وان هەبیت، و لێپرسینێ دگەلدا بکەن، کو ئەڤە ناڤەڕوکا دیموکراسیێ یە)، ئەڤ ناڤەڕوکە تشتەکێ گەلەك کەڤنە، ب ئەڤان بەلگەهێن ل خوارێ:

١- ئەگەر بەرێ خو بدەینە قورئانا پیروز، ل وی دەمێ خودایێ مەزن بەحسێ شاهـ ژنا (سبأ) دکەت، کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ ﴾ النمل.

شاهـ ژنێ گوت: ئەی ڕیسپی و ماقویل و کەسێن کاربدەست! نامەیەکا ب قەدر ژ مروڤەکێ مەزن ژبو من هاتیە، ناڤەروکا وێ هوسایە: ئەڤە ژ سولەیمانی یە، و بناڤێ خودایێ پڕ دلوڤانێ دلوڤانکار، هوین ژ ئاستێ من خو مەزن نەکەن، و ب ملکەچی و بێی هێڤە و وێڤە ب موسلمانی وەرنە دەف من! وێ شاهـ ژنێ گوت: ئەی کاربدەست و ڕیسپی و مروڤێن ماقویل! بوچوونا هەوە چییە؟ هەتا هوین بڕیارێ نەدەن، ئەز چ بڕیاران نادەم...

هەروەکی ئەم دبینین، زڤڕین ژبو بوچوونا خەلکی، زڤڕین ژبو نوینەرێن خەلکی، د قورئانێ دا هاتیە، ئەڤجا نە ژلایێ بەرپرسەکێ زەلامڤە، بەلکو ژلایێ بەرپرسەکا ئافرەتڤە، کو شاهـ ژنەکە.

٢- (ڕاوول مانغلابوس) د پەرتووکەکێدا، کو ژبو عەرەبیێ هاتیە وەرگێڕان ب ناڤ و نیشانێ (إرادة الشعوب)، دبێژیت: {دیموکراسیی ژبەری دەستهەلاتا ڕومانیان، ل باکورێ ئەورووپا حوکم دکر، ل نەرویج و دانیمارك و ئایسلەندا}[1].

٣- هەروەسا هەر (مانغلابوس) د هەمان پەرتووکدا، د لاپەڕێ (١٣٣)دا، دبێژیت: {دناڤ هندیێن سوڕ یێن ئەمریکا دا ژی، دیموکراسی وەك ناڤەڕوك هەبوویە، و ب هەلبژاردن خەلکی بەرپرسێن خو دانانە، و ب زمانێ خو گوتیێ (ساخیم)}.

(١) إرادة الشعوب، قبرص/ ١٩٩١م، ص١٨.

٤- هەروەسا هەر (مـانغلابوس) د هـەمان پەرتووكـدا، د لاپـەڕێ (٤٠ - ٢)دا دبێژيت: ل وەلاتێ ميزوپوتاميا (ما بين النهرين)، ژبەرى (٤٥٠٠) سالان ژبەرى نوكە، ئەو سيستەمە يێ بەربەلاڤ بوويە، ب تايبـەتى ل بـاژێڕێ (ئيـبلا) كـو ئاكنجيێن وێ سيهـ هزار (٣٠٠٠٠) كەس بوون، و دوازدە هزار (١٢٠٠٠) كارمەند هەبوون، و وەلاتەكێ دوو سەد و پێنجى هزار (٢٥٠٠٠٠) كەسى بوويە.

٥- هەروەسا (ئيف شمێل) د پەرتووكا: (السياسه فى الشرق القديم) د لاپەڕێ (٤٢ و ٤٣)دا، و (صاموئيل نوح كريم) د پەرتووكا: (تـأريخ سـومر) د لاپـەڕێ (٦١)دا دبێـژن: {سـێ هـزار (٣٠٠٠) سـالان ژبـەرى زايـينى، ل وان دەڤـەرێن (دناڤبەرا دوو ڕووبياران)دا، كومەلگـەهێن وان ژلايـێ دوو مەجلسـانڤە دهاتنـە برێڤە برن، مەجلسەك ژبو خەلكێ ب تەمـەن بـوو، و مەجلسـەك ژبـو كەسـێن شەرڤان بوو}.

٦- هەروەسا هەر (مانغلابوس) د هـەمان پەڕتووكـدا، د لاپـەڕێ (٤٣-٤٧)دا دبێـژيت: (ل هينـدێ ژى شـەش سـەد سـالان ژبـەرى زايـينى، (١٢) كومـار (جمهورية) هەبوون، كو سەروكێ ئێك ژ وان بابێ (بوزا)ى بوويە، كـو دگوتنـە هەر ئێك ژ وان سەروكان (راجا) و ب هەلبژاردن هاتبوونە دانان}.

٧- هەروەسـا ل مەككـەهێ ژى ژبـەرى ئيسـلامێ، قورەيشـيان (دار النـدوة) هەبوو، هەروەكى (إبن هشام) د (السيرة النبوية) دا ئينايە.

**ئەڤجا ئەرێ خويشك و برايێن بەڕێز!**

**ئەگەرێ ئەڤێ چەندێ چيە؟**

**هەر ب كورتى دێ بێـژم:** سروشـت و فيتڕەتـا سـاخ يـا مروڤـى، هـەردەم عەڤدالێ تشتێن باش و ب مفايە، ئەڤجا حالەتێ ئاسايى و سروشـتيێ مروڤـى هوسايە، كو چ كەسـەكى پێخـوش نينـە بهێتـە تەبەسـەركرن، و چ كەسـەكى

پێخوش نینە حسێب ژبو نەهێتە کرن، ئەڤجا ئەڤ ناڤەڕوکە (ئەز نابێژم: پەیڤا دیموکراسی، بەلکو دبێژم: ئەڤ ناڤەڕوکە)، کو خەلك هەمی پشکداربن د دەستهەلات و حوکمڕانییێدا، تشتەکێ کەڤنە د ژیانا بەشەری دا، دناڤ پتریا کومەلگەهاندا هەبوویە، و تشتەك نینە ل ئەوروپا دەرکەفتبیت، و ژبەری کو ل یونانێ هەبیت، ل هەردوو باژێرێن ئەسپارتە و ئەسینا، ژبەری هینگی د دیروکا بەشەری دا هەبوویە، چ ل ئەوروپا، و چ ل ئاسیا، و چ ل ئەفریقیا، و چ ل وان هەمی جهێن، کو بەشەر تێدا ژیاینە.

**ئەڤێ کورتە سەرهاتیا دیموکراسییێ ژی، دێ ب سێ سەرنجان بدوماهی ئینم:**

**ئێکەم: دیموکراسی ل یونانێ:**

١- ل یونانێ دیموکراسییا ڕاستەوخو هەبوویە و نوینەرایەتی نەبوویە، خەلك ڕاستەوخو ل مەیدانەکێ کوم بوویە، و بوچوونا خو دایە.

٢- ئەڤ چەندە بتنێ ژبو زەلامان بوویە.

٣- و بتنێ ژبو زەلامێن ئازاد بوویە.

٤- و بتنێ ژبو یونانییان بوویە.

**دووەم: دیموکراسییا ڕوژئاڤا:**

پشتی کو خەلك ل ڕوژئاڤا ژ کەنیسێ ڕەڤین، لدویڤ سیستەمەکێ حوکمڕانیا وەسا گەڕیان، کو خەلك بشێن ب تەبایی بژین، ئەڤجا دەمێ وان دیروکا خو ڤەکولی، دیموکراسی دوبارە ژێ دەرئێخست، ب ڕەنگێ وێ یێ یونانی، بەلێ هەر ل دەستپێکێ ب شێوەیەکێ نوینەراتیەتی (نیابي) بوو، نەکو ڕاستەوخو (مباشر)، و خو ئەو ژی هەردیسان ل دەستپێکێ ب ئەڤی

ڕەنگێ نوکە هەی، نەبوو، بەلکو بتنێ کەسێن دەولەمەند ماف هەبوو دەنگێ خو بدەن، پاشی ئەو مەرجە ڕاکر، بتنێ زەلامان مافێ دەنگدانێ هەبوو، پاشی هێدی هێدی پشکداری ب ئافرەتان ژی هاتە کرن، ئەڤجا گەلەك قویناغ دەرباز کرن، هەتا گەهشتیە ڕەنگ و شێوەیێ نوکە.

**سێیەم:**

نوکە ژی بەردەوام ڕەخنە ل دیموکراسیێ دهێتە گرتن، دهێتە چاککرن، و دەستکاری تێدا دهێتەکرن، هەروەسا دیموکراسییا هەر وەلاتەکی ژ یا وەلاتەکێ دیتر جودایە، و هەر ئێك ژ وان نیشانێن خو یێن تایبەت هەنە.

## تەوەرێ سیێ:

## بەراوردیەك دناڤبەرا دیموکراسیێ و سیستەمێ حوکمڕانیێ د ئیسلامێدا

**دشێین ژبو بەراوردکرنا دیموکراسیێ و سیستەمێ حوکمڕانیێ د ئیسلامێ دا بێژین: سیستەمێ حوکمڕانیێ د ئیسلامێدا، حەفت بنەما و نیشانەیێن هەین[1]:**

١- خەلك و جەماوەر ب گشتی ژێدەرێ دەستهەلاتێ نە.

٢- مشێورەت (شورى) بناغێ حوکمڕانیێ یە.

٣- حوکمەت د ئیسلامێ دا مەدەنی یە، نەکو ئاییني، و حوکمڕان وەکیلێن خەلکی نە، نەکو یێن خودێ.

٤- کار و چالاکیێن سیاسی، نەکو بتنێ مافە، بەلکو ئەرکێ هەر هاولاتیەکی یە، ب موسلمان و نەموسلمانڤە، بێ جیاوازی.

٥- دەولەتا ئیسلامی دەستێ وێ یێ ڤەکریە، ژبو وەرگرتنا هەر بیروکە و ئامراز و ئەگەرەکێ، کو بەرژەوەندی (تحقيق مصلحة)یەك ژێ بدەستڤە دهێت.

---

(١) د بەرگێ دوویێ یێ مەوسووعەیا: (ئیسلام و دەولەتداریی)دا، ب ناڤ و نیشانێ (بنەماکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی) مە دەهـ (١٠) بنەمایێن مەزن و گرنگ یێن ئینان، و ئەم ب درێژاهیی یێن لسەر ئاخفتین.

٦- حوكمڕان د ئیسلامێدا، د بنیاتدا پیرۆز (مقدس) نینن، هەتا كو بهێنە پیرۆزكرن.
٧- ڕەخنە لێ گرتن و بەرسینگگرتنا حوكمڕانێن ستەمكار، مەزنترین جورێ جیهادێ یە.

**نوكە ژی ب كورتی، دێ تیرۆژكەكێ دەینە لسەر هەر ئێك ژ وان:**

**١- خەلك و جەماوەر ب گشتی ژێدەرێ دەستهەلاتێ نە:**

ئەڤە ئێكە ژ بنەماییێن مەزن و گرنگێن حوكمڕانیێ د ئیسلامێدا، ئەڤجا هەروەكی ژبەری نوكە مە گوتی، دشێین گەلەك بەلگەهان لسەر ئەڤێ چەندێ بینین:

**ئێك:** هەمی پەیڤین (خطابات)ێن قورئانێ ژبو كومەلگەها ئیسلامی، هەمی ب: (يَا أيّها النَّاس) و (يَا أيّها الّذِينَ أمَنُوا) دەست پێدكەن.

**دوو:** خودایێ زانا و شارەزا فەرمان یا ل هەمی خەلكی و كومەلگەها موسلمانان كری، كو كاروبارێن بەرپرسیارەتییێ و حوكمڕانییێ، ڕادەستی كەسێن ژهەژی بكەن:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا .. ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء.

ئەڤجا: د بنیاتدا بەرپرسیارەتی و حوكمڕانی، یا خەلكی و كومەلگەهێ یە.

**سێ:** ئێكەمین قەوارەیا سیاسی د ئیسلامێدا، كو لسەر دەستێ پێغەمبەرێ خاتەم (صلى الله عليه وسلم) هاتە دەمەزراندن، پشتی پەیمانا ئێكێ و دوویێ یا عەقەبێ (بيعتي العقبة الأولى والثانية) بوو: هەروەكی د (السيرة النبوية لابن هشام) دا هاتیە.

**٢- مشێورەت (شوری) بناغێ حوکمڕانییێ یە:**

هەروەکی خودایێ دادگەر کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿ ...وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...﴿٣٨﴾ ﴾ الشوري.

ئانکو: و کاروبارێن باوەرداران د ناڤبەرا وان دا ب مشێورەتێ یە.

پەیڤا (أمر) ژی هەر چەند تێگەهێ وێ یێ گشتی و بەرفرەهە، و هەمی جورێن کاروباران بخوڤە دگریت، بەلێ پتر کاروبارێن: شەڕی، ئاشتی، سیاسی و جڤاکی بخوڤە دگریت.

**٣- حوکمەت د ئیسلامێ دا مەدەنی یە، نەکو ئایینی، و حوکمڕان وەکیلێن خەلکی نە، نەکو یێن خودێ:**

جیاوازیا بنەڕەتی دناڤبەرا حوکمەتا مەدەنی و حوکمەتا ئایینی، ئەوە کو حوکمەتا مەدەنی لسەر بناغێ ڕەوایەتی (شرعية) وەرگرتنێ ژ خەلکی دهێتە دامەزراندن، بەلێ حوکمەتا ئایینی خەیالا وێ ئەوە، کو شەرعیەت یا ژ خودێ وەرگرتی! هەژی گوتنێ یە ژبەری نوکە ب ئەڤی جورێ حوکمڕانییێ هاتیە گوتن (ثیوکڕاسی Theocracy) ئانکو: حوکمێ خودایی، یان حوکمێ ئایینی، و ئەو جورێ حوکمڕانییێ، چەندین سەدەیان ل وەلاتێن ڕوژئاڤا یا بەربەلاڤ بوو، هەتا سەرهلدانا شورەشا فرەنسا، ل سالا: ١٧٨٩ز.

دشێین گەلەك بەلگەهان لسەر ئەڤێ چەندێ بینین، کو حوکمڕانی د ئیسلامێدا، مەدەنی یە، نەکو ئایینی:

## ئێك: خەلك و جەماوەر ب گشتی خودان و ژێدەرێ دەستهەلاتێ نە:

أ- هەروەکی د بنەمایێ ئێکێدا مە گوتی، خەلك و جەماوەر ب گشتی ژێدەر و خودانێن دەستهەلاتا سیاسی نە، هەر ژبەر ئەڤێ چەندێ پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) هەتا کو ل پەیمانا ئێکێ یا عەقەبێ و پەیمانا دوویێ یا عەقەبێ، شەرعییەت ژ خەلکێ باژێرێ (يثرب) وەرنەگرت، مشەخت نەبوو و قەوارەیا خو یا سیاسی ڕانەگەهاند، هەر چەندە بێگومان هەر ژ روژا ئێکێ شەرعیەتا ئاسمانی و خودایی هەبوو، بەلێ هەتا کو شەرعیەتا ئەردی و خەلکی بدەستڤە نەئینای، قەوارەیا خو یا سیاسی ئاشکەرا نەکر!

ب- ئەبوبەکرێ ڕاستگو (خودێ ژێ ڕازی بیت)، ئێکەمین خەلیفەیێ پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم)، دەمێ موسلمانان هەلبژارد و بەیعەت دایێ، د ئێکەمین گوتارا خو دا گوت: (يَا أَيُّهَا النَّاس! إِنِّي قَدْ وُلِّيْتُ عَلَيْكُمْ وَلَسْتُ بِخَيْرِكُمْ، فَإِنْ أَحْسَنْتُ، فَأَعِينُونِي، وإِنْ أَسَأْتُ فَقَوِّمُونِي)[1].

ئانکو: ئەی گەلی خەلکی! ئەز لسەر هەوە کرمە سەرپەرشتیار، بەلێ ئەز نە باشترینێ هەوەمە، ئەڤجا ئەگەر من باشی کر، هاریکاریا من بکەن، و ئەگەر من خڕابی کر، من ڕاست ڤەکەن.

(١) الكامل في التاريخ، لأبن الأثير ج ص ٢٢٥.

**دوو : حوكمڕان پێگیرن ب دەستور و یاساییێ:**

هەروەكی خودایێ بلند و مەزن كەرەم دكەت و دبێژیت:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية.

**سێ: حوكمڕان ژ تەخ و بنەماڵە و نەتەوەیەكێ دیاركری نینە:**

هەر ئێك ژ چوار خەلیفەیێن ڕاشد (ئەبوبەكر، عومەر، عوسمان، عەلی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ ئیجاخ و عەشیرەتێن جودا جودا بوون:



١- ئەبوبەكر (بنو تميم).

٢- عومەر ( بنو عدي).

٣- عوسمان ( بنو أمية).

٤- عەلی ( بنو هاشم).

هەلبەت ئیجاخ و عەشیرەتێن وی دەمی، ل جهێ حزبێن سیاسییێن ئەڤرو بوون، ئانكو، دناڤبەرا وان چوار لایەنێن سیاسی دا، ڕادەستكرنا ئاشتییانە یا دەستهەلاتێ هەبوویە !

ئەڤجا ئەوا (معاوية بن أبی سفيان) كری، ب دەقێ فەرموودەیا پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم)، لادان بوو ژ ڕێباز و ڕێكا وی، هەروەكی كەرەم دكەت و دبێژیت: {أَوَّلُ مَنْ يُغَيِّرُ سُنَّتِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ} (أَخْرَجَه ابْنُ أَبِي عَاصِم في (الأوائل) (ج٧، ص٢)، قَالَ الألباني: وَهَذَا إِسْنَادٌ حَسَنٌ، رِجَالُهُ ثِقَات رِجَالُ الشَّيْخَيْنِ غَيْرَ المُهَاجِر وَهُوَ ابْنُ مُخَلَّد)، ئانكو: ئێكەمین كەس كو ڕێبازا من د گوهوریت، زەلامەكە ژ ئیجاخا بەنی ئومەیە، (ألباني) ژی دبێژیت: (وَلَعَلَّ المُرَاد بالحَديث تَغيير نِظَام اختيَار الخَليفَة وَجعله وراثة وهو الظاهر)،

ئانكو: دبيت مەرەم ژ ئـەڤێ فـەرموودەیێ، گوهورینـا سیسـتەمێ هەلبـژاردنا خەلیفەی بیت و گوهورینا وێ بیت ژبو میراتگرییێ، هەر هوسا ژی دیارە.

**٤- کـار و چـالاکیێن سیاسـی نـەکو هـەر مافـە، بـەلکو ئـەرکێ هـەر هاولاتییەکی یە، ب موسلمان و نەموسلمانانڤە، بێ جیاوازی:**

لدور ئەڤێ چەندێ ژی د گونجیت گەلەك بەلگەهان بینین: بو نموونە:

١- ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ...﴿٧١﴾ ﴾ التوبة.

ئـانكو: زەلامـێن بـاوەردار و ئـافرەتێن بـاوەردار، هنـدەك ژ وان دوسـت و پشتەڤانێن هندەکانە، فەرمانێ ب چاکیێ، و ڕێگرییێ ل خرابیێ دکەن.

دیارە فەرمان کرن ب هەر کارەکێ باش، و ڕێگری ل هەر کـارەکێ خـراپ، تێگەهێ وێ گەلەکێ بەرفرەهـ و گشـتی یـە، و هـەمی بـوار و لایـەنێن ژیـان و ژیار و دینداری و دونیـادارییێ بخوڤـە دگریـت: هـزری، عەقیـدەیی، سیاسـی، ئابوری، جڤاکی.

ئەڤە ب نسبەتی موسلمانان ب گشتی.

٢- ب نسـبەتی نەموسـلمانان ژی، دا بـەرێخودانێ ژبـو دوو دەقـان (نـص) بکەین، د دوو پەیمان و ڕێککەفتننامەیێن دناڤبەرا پێغەمبەرێ خـودێ (صـلی الله علیە وسلم) و موسلمانان ژ لایەکی، و جوهی و نەصرانی ژ لایەکێ دیتر:

أ- د وێ (وثیقـة)یـا کـو پێغەمبـەرێ خـودێ، دناڤبـەرا پێکهاتـەیێن بـاژێرێ مەدینێ دا نڤیسی، وەکی دەستورێ نوکە بوو، دبرگەیا (٢٥)ێ دا هاتیە:

(وَأَنَّ يَهود بَني عَوْف أُمَّة مَعَ المؤمنين، لليهود دينهم وللمؤمنين دينهم...)[1].
ئانكو: و جوهيێن بەنى عەوف كومەكن، قەوارەيەكن دگەل باوەڕداران، جوهييان ئايينىٚ خو هەيە، باوەڕداران ژى ئايينىٚ خو هەيە.

ب– د وىٚ (وثيقة)يا كو پێغەمبەرىٚ خودىٚ (صلى الله عليه وسلم) ژبو نەصرانييێن نەجرانىٚ نڤيسى، هاتيە:
(.. لأني أعْطَيتهُم عَهْد الله أنَّ لَهُمْ مَا لِلْمُسْلمِينَ وعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ، وَعَلَى المُسْلِمِينَ مَا عَلَيْهِم.. بالعَهْد الَّذي اسْتَوجبُوا حَقَّ الذِّمَام وَالذَّبَّ عَنِ الحُرْمَة، واستوجبوا أنْ يُذبَّ عَنْهُمْ كُلُّ مَكْرُوه، حَتَّى يَكُونوا للمُسْلمِين شُرَكَاء، فِيمَا لَهُمْ وَفِيمَا عَلَيْهِمِ ..)[2].
ئانكو: .. و چونكى من پەيمانا خودىٚ دايە هەوە، كو هەمان ئەو مافێن موسلّمانان هەين، ئەوان ژى هەبن، و هەمان ئەو ئەركێن لسەر موسلّمانان هەين، لسەر وان ژى هەبن، و هەمان ئەو ئەركىٚ لسەر وان لسەر موسلّمانان ژى هەبن، ل دويڤ وىٚ پەيمانىٚ كو ب ئەگەرىٚ وىٚ، لسەر موسلّمانان پێدڤى بوويە، كەرامەت و حورمەتا وان بپارێزن، و لسەر موسلّمانان پێدڤى بوويە، كو هەر خرابيەكىٚ ژ وان دوير بكەن، هەتا كو د ئەنجامدا: د هەمان ماف و ئەركاندا، ببنە هەڤبەش و هەڤپشكێن موسلّمانان.

بێگومان ئەو ڕستەيا: (حَتَّى يَكُونوا للمُسْلِمِين شُرَكَاء، فِيمَا لَهُمْ وَفِيمَا عَلَيْهِمِ)، هەمى وان ئەرك و مافان بخوڤە دگريت، كو بێى دەستەبەركرنا وان، هاووڵاتى بوون (مواطنة)، يان ب تەعبيرا پێغەمبەرىٚ خاتەم (صلى الله عليه

(١) بەرىٚ خو بدە: مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة، محمد حميد الله، ص٥٧ – ٦٢، (كتابه صلى الله عليه وسلم بين المهاجرين والأنصار، واليهود، وهو دستور الدولة البلدية بالمدنية).
(٢) ژێدەرىٚ بورى، ص١٨٨، ١٨٩ (نسختان : المكتوب النبي صلي الله عليه وسلم إلى نجران).

وسلم): هەڤپشکی (شراکة) هەڤپشك (شرکاء)، ناهێتە هەبوونێ، ب تایبەت مافێن سیاسی.

ئەڤجا پێدڤی یە د ڤێرێ دا ئەو ڕاستی یە ژی بهێتە زانین، کو د سەردەمێ پێغەمبەرێ خودێ (صلی الله علیە وسلم)دا، ئەو جوهی و نەصرانییێن لبن سێبەرا دەولەتا ئیسلامێ، و دەستهەلاتا وێ دا دژیان، لەوانێ نەهاتبوونە دناڤ پێکهاتەیا قەوارەیا سیاسیا پێغەمبەری (صلی الله علیە وسلم)، چونکی ئەوان بخو قەوارەیێن سیاسی یێن خو هەبووینە، و ب زاراڤێ نوکە: د حالەتێ فیدراڵی و کونفیدراڵییێ دا بوون، دگەل دەولەتا ئیسلامی.

**٥- دەولەتا ئیسلامی دەستێ وێ یێ ڤەکریە، ژبو وەرگرتنا هەر بیروکە و ئامراز و ئەگەرەکێ، کو بەرژەوەندی (تحقیق مصلحة)یەك ژێ بدەستڤە دهێت:**

د گونجیت لدور ئەڤێ چەندێ گەلەك بەلگەهان بینین، کو ئیسلامێ نەکو هەر دەستێ موسڵمانان ب گشتی، و قەوارەیێن سیاسی ب تایبەتی، ڤەکریە ژبو وەرگرتنا بیروکە و ئەزموون و ئامراز و ئەگەرێن مفایێ دگەهینن، بەلکو لسەر وان پێدڤی ژی کریە، بو نموونە:

أ- ﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر.

هەروەکی ژبەری نوکە ژی، مە ئەڤ ئایەتە ئینا، و ڕامانا وێ ژی مە گوت.

ب- {أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: ٢٣٦٣، وَغَيْرُهُ).

ئانکو : هوین دکاروبارێن خو یێن دونیایێ دا شارەزا و زاناترن.

بێگومان مەرەم ژێ ئەو کاروبارن، کو ئەزموون و شارەزایی و بسپوری ژبو دڤێت، هەروەکی د ئەگەرێ هاتنا وێ (سبب الورود)دا دیارە، کو بریتیە ژ سەرهاتیا متوربەکرنا (تلقیح) دارێن خورمێ، کو پێغەمبەرێ خودێ (صلی الله علیه وسلم)، ب دیتنا وی وەسا بوو کو پێدڤی ناکەت، و ئەوان ژی "ئەوێن متوربەکرنێ دکەن" وەسا زانی وەك ئایین و وەحی خودێ ئەڤ چەندە ژبو وان یا ڕوون کری، و کارێ خو یێ متوربە کرنێ نەکر و دارێن خورمێ بەرهەم نەدا، یان بەرهەمەکێ خراب دا، ئەڤجا پشتی کو پێغەمبەرێ خودێ ئەڤ مەسەلەیە زانی، ژبو وان ڕوون کر، کو بتنێ وەك بوچوونا خو یا تایبەت، ئەو چەندە گوتیە، و گوتە وان بلا ژبو کاروبارێن خو یێن دونیایێ، کو پێدڤی ب شارەزایی و ئەزموون و بسپوریێ هەیە، پشت بەستنێ لسەر خو بکەن.

## ٦- حوکمڕان د ئیسلامێدا، د بنیاتدا پیروز (مقدس) نینن، هەتا کو بهێنە پیروزکرن:

د نێرینا ئیسلامێدا هەمی مروڤ "بێ جیاوازی" بەرێزن: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾﴾ الإسراء، بەلێ چ کەس: حوکمڕان و غەیری حوکمڕان، ب پاقژ و بێ خەلەتی و پیروز (مقدس) ناهێنە دانان.

و خودایێ کاربنەجه د قورئانێدا، ئامارژە ب گەلەك خالێن لاواز (نقاط ضعف) و سالوخەتێن خراپ یێن مروڤان کریە، کو ئەگەر ئیمان ب خودێ، و دەستگرتن ب ئایینی و پەیاما خودێ نەبیت، کەسەك ژ وان خالان دەرباز نابیت:

١- ﴿وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾﴾ الأحزاب.

٢- ﴿خُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ مِنْ عَجَلٍ سَأُوْرِيكُمْ ءَايَٰتِي فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ ﴿٣٧﴾﴾ الأنبياء.

٣- ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ۚ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾ ﴾ النساء.

٤- ﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ ﴾ الكهف.

٥- ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ ﴿٦٦﴾ ﴾ الحج.

٦ و ٧- ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ﴾ العاديات.

پێغەمبەرێ خودێ ژی (صلی الله علیە وسلم) لدور کرنا گونەهـ و خەلەتییێن هەمی مروڤان گوتیە: {"كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، خَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ"}[1]. ئانکو: هەمی دویندەها ئادەمی خەلەتیان دکەن، و باشترینێ ئەوێن خەلەتیان ژی دکەن، ئەون یێن گەلەک ژبو لایێ خودێ دزڤڕن.

## ٧- ڕەخنە لێ گرتن و بەرسینگگرتنا حوکمڕانێن ستەمکار، مەزنترین جیهادە.

ل دەستپێکێ دبێژین:

خودایێ دادگەر نفرین ل ستەمکاران کریە:

أ- ﴿ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الأعراف.

ب- ﴿ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ هود.

ئەڤجا بێگومان حوکمڕانێ ستەمکار، ژبەری هەر ستەمەکێ، دێ کەڤیتە لبن نفرینا (لعنة) خودایێ دادگەر، و هەر کەسەکێ خودایێ مەزن نفرینا لێ

(١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٣٠٧٢)، وَالتِّرمذِيُّ برقم: (٢٤٩٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٥١)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧٢٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٦١٧) وَقَالَ: صحيح الإسناد، وَحَسَّنَهُ الألباني في "المشكاة" برقم: (٢٣٤١) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه.

بكەت، پێدڤی یە ڕەخنە لێ بهێتە گرتن، و هەتا بەرسینگێن وی ژی بهێتە گرتن، و دەستێ وی ژی بهێتە گرتن!

لەوما ژی پێغەمبەرێ خودێ (صلی الله علیه وسلم) كەرەم كریە و گوتیە:

أ- {إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الْجِهَادِ كَلِمَةَ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ} (أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٧٤)، وَصَحَّحَهُ كُلٌّ مِن الألبَاني وَشُعَيْب الأرنؤوط).

ئانكو: بێگومان گوتنەكا دادگەرانە لـدەڤ حوكمڕانـەكێ ستەمكار، مەزنترین جیهادە.

ب- {إِذَا رَأَيْتَ أُمَّتِي تَهَابُ الظَّالِمَ، أَنْ تَقُولَ لَهُ: أَنْتَ ظَالِمٌ، فَقَدْ تُوُدِّعَ مِنْهُمْ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٧٨٤)، صحَّحَهُ أحمد شاكر، وَأَخْرَجَهُ البَزَّار برقم: (٢٣٧٥)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٠٣٦)، وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد وَوَافقه الذهبي، وَالبَيْهَقِي فِي "شعب الإيمان" برقم: (٧٥٤٦)).

ئانكو: هەر دەمێ تە ئوممەتا من دیت ژ ستەمكاری دترسیا، كو بێژیتێ: تو ستەمكاری! بزانە خاترا خو یا ژێ هاتیە خواستن و حسێبا وان یا بدوماهی هاتی.

## كورتیا بوچوونا بەندەی لدور دیموكراسییێ:

**دپێنج خالان دا كورتیا بیر و بوچوونا خو لدور دیموكراسییێ، دێ دەمە دیاركرن:**

**ئێك:** هەر چەندە دیموكراسی وەك هەر بیروكەیەكا دیتر یا بەرهەمێ بیر و هزرێن مروڤی، بێ كێم و كاسی نینە، بەلێ "هەروەكی ژبەری چەند سالان من گوتیە و نوكە ژی دبێژم:" دیموكراسی دناڤ سیستەم و شێوازێن دی یێن بەریەلاڤێن حوكمڕانییێ، باشترین شێوازە، كو مروڤی ژبو برێڤەبرنا كاروبارێن كومەلگەهێ و دەولەتێ، بەرهەم ئینایە، و دیموكراسی (چاكێ دناڤ خرابان

دایە)، و (ل هەمبەر تشتێن شل، تشتەکێ پەیتە)! و ب بوچوونا من: دگەل هەبوونا هندەك تێبینیێن هویر لسەر هندەك لایەنێن دیموکراسیێ، بەلێ ب گشتی وەك میکانزمێ حوکمڕانیێ، هەتا نوکە سەرکەفتیترین شێوازێ حوکمڕانیێ یە، و خرابیێن وێ ژ هەمیێن دیتر کێمترە.

**دوو:** چ ژ بنەمایێن:

١- خەلك ژێدەرێ دەستهەلاتێ.

٢- هەلبژاردن.

٣- ژێك جودا کرنا هەر سێ دەستهەلاتان.

٤- سەروەریا یاسایێ.

٥- دابینکرنا ماف و ئازادیان بۆ هاوولاتیان، بێ جیاوازی.

٦- ڕادەستکرنا دەستهەلاتێ، ب ڕەنگەکێ ئاشتیانە.

٧- حوکوم کرنا زورینەیان، و پاراستنا مافێن کەمینەیان.

نەکو هەر ناکوکی دگەل ئیسلامێ نینە، بەلکو پێدڤینە ژی، چ ب حوکمێ وان دەقێن ڕاستەوخو یێن شەریعەتی، و چ ب حوکمێ چەندین بنەمایێن شەرعی، بو نموونە:

١- (أَيْنَمَا وجد العَدْلُ فَثَمَّ شَرْعُ الله، وَأَيْنَمَا وَجدت المَصْلَحَة فَثَمَّ شَرْعُ الله).

ئانکو: دادگەری لکیڤە بیت، شەریعەتێ خودێ ژی ل وێرێ یە، و بەرژەوەندی ل کیڤە بیت شەریعەتێ خودێ ژی ل وێرێ یە.

٢- (للوَسَائِل حُكْم المَقَاصِد).

ئانکو: ئامراز و ئەگەران، هەمان حوکمێ ئارمانجان هەیە.

٣- (مَا لاَ يَتِمُّ الْوَاجِبُ إِلاَّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ).

ئانکو: هەر فەرزەك بێی هەبونا تشتەکی نەهێتە کرن، ئەو تشت ژی فەرزە.

٤- (الأَمْرُ بالشيءِ، أَمْرٌ به وَبِمَا لا يتم إِلاَّ بِـهِ، وَالنَّهْـيُ عَـنْ الشَّـيْءِ، نَهيٌ عَنْـهُ وَعَمَّا يُؤَدِّي إِلَيْهِ).

ئـانکو: فـەرمان کـرن ب تشـتەکی، فەرمانکرنـە ب وی تشـتی بخـو، و ب وی تشتی ژی، کو بێی ئەو ناهێتە کـرن، و رێگـری ژ تشـتەکی، رێگـری یـە ل وی تشتی بخو، و ل وی تشتی ژی، کو ژێ پەیدا دبیت.

٥- (الأَصْلُ فِي المُعَامَلاَتِ العَفو، إِلاَّ ما دَلَّ الشَّرْعُ عَلَى مَنْعه).

ئـانکو: بناغـە د کاروکریـار و رابـین و رویینشـتناندا، رێپێدانـە، ژبلـی ئـەوا شەریعەت رێك لێ گرتنێ ژێ ددەتە دیارکرن.

**سێ:** ئاریشە و ئیشکالا بنەرەتی، کو د دیموکراسییێدا هەیە، ئەوە کو رەهاییا مـافێ یاسـادانان (تشـریع) و بریـاردانێ ددەتــە دەسـتێ خـەلکی، بـەلێ د ئیسـلامێدا سـەروەریا رەهـا و بلنـدا یاسـادانانێ (حاکمیـة التشـریع المطلقـة والعُلْيَا) بتنێ یا خودێ یە، و هەتا یا پێغەمبەری ژی نینـە، هـەروەکی خـودێ لسەر زارێ (یوسف) علیه السلام کەرەم کریە و گوتیە:

أ- ﴿ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ یوسف.

ب- ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾ الشوري.

کو بێگومان مەرەم ژ پەیڤا (الحکم) د ئایەتا ئێکێ دا، و پەیڤا (شـرعوا) د ئایەتا دوویێ دا، یاسادانان و دیارکرنا چاکی و خرابیێ، و حـەلالی و حـەرامیێ یە، ئەڤ چەندە ژی تایبەتە ب خودایێ دلوڤانڤە.

**چوار:** بەلێ دەمێ ئەم بەحسێ تایبەتبوونا: سەروەرییا بلند و ڕەهایا یاسادانانێ، ب خودێڤە گرێددەین، نابیت ژ دوو ڕاستییێن دیتر یێن گرنگ بێ ئاگەهـ بین:

١- سەروەریا بلندا سیاسی، کو دبێژنێ: دەستهەلات (سلطة) یا خەلکی و کومەلگەهێ یە، و هەر ئەو بخونە کو بەرپرسێن خو د هەمی بوارانـدا هەلدبژێرن و لێپرسینێ دگەلدا دکەن، و ئەگەر وان ب پێدڤی ژی زانی، دێ وان لادەن.

٢- هەروەسا خەلك و کومەلگەها موسلمان، سەروەریا بەشێ یاسادانانێ (السیادة الجزئیة التشریعیة) هەیە، لبەر ڕوناهیا شەریعەتی، پێکول (إجتهاد)ێ دکەن و یاسایان دادنێن.

**پێنج:** جیاوازیا سەرەکی دناڤبەرا مشێورەت (شوری) یا ئیسلامێ و دیموکراسیێ، ئەڤەیە، کو دیموکراسیێ چ چوارچوڤە و پەرژانەك نینە، کو وێ ژ لادانێ بپارێزیت، بەلێ مشێورەت (شوری) یا ئیسلامێ، ب شریعەتی هاتیە دورپێچ کرن و ژ خەلەتی و لادانێ یا پاراستی یە، خودایێ زانا وشارەزا ژی کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ ﴾ (٧١) المؤمنون.

ئانکو: و ئەگەر حەقی لدویڤ دل و ئارەزوییێن وان کەفتبا، ئەسمان و ئەرد و هەر کەس، کو تێدانە، دا تێکچن.

بەلێ، ئەو سنورێن چاکی و خرابی و حەلالی و حەرامی، کو شریعەتی دیار کرین، چ کەس و چ پەرلەمان و ئەنجوومەنەکی ماف نینە ببەزینیت، و یاسا و بریارەکێ دەربکەت، کو دگەل شریعەت و یاساییێن وێ یێن ئاشکەرا، هەڤدژ بیت.

بەلێ، دڤێت دانپێدانێ ب وێ ڕاستیا تەعل ژی بکەین، کو ب لێبورینڤە، هەر ل دەمەکێ زوی ژلایێ موعاویەیێ کوڕێ ئەبو سوفیانی و ئەمەوویانڤە، د بوارێ حوکمڕانییێدا، و ب تایبەت ژبو دانانا بەرپرسان "مشێورەت (شوری) هاتە ژ کار ئێخستن"، و نەهێلا گەشەیێ بکەت، و ل چەند دام و دەزگەهـ و میکانزم، (مؤسسات وآليات)ەکێ دا، دەستەبەر ببیت، و پتر وەکی بها (قيمة)یەکێ ڕەوشتی و مەعنەوی و تیوریی ما.

لەوما نوکە، ئەگەر مە بڤێت مشێورەتێ کارا و پڕاکتیزە بکەین، پێدڤییە مفایێ ژ میکانزمێن دیموکراسیێ وەربگرین، کو ب پشت ڕاستی، ئەها ئەڤە "مفاداربوون ژ ئەزموون و ئامرازێن خەلکێ دیتر" ڕێباز و شێوازێ حومکڕانیی و ئیدارەیا پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) و خەلیفەیێن ڕاشد بوویە و ل دەمێ خو دا ئەوان ژ ئەزموون و ئامرازێن فارس و ڕومییان، مفاییێن باش وەرگرتینە، دگەل دەستگرتن و پێگیریا وان ب یاسا و بهاییێن شەریعەتی.

**خویشك و برایێن بەڕێز!**

هـەر ئـایین و بەرنامەیـەك، دڤێـت ئارمانجـا وی ئـەو بیـت، کـو د واقعیـدا دەستەبەر ببیـت، و ئەگـەرێ پێشـڤەبرنا ژیانـا خـەلکی و بەختـەوەرکرنا وان بیت، خودایێ دلوڤان کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ ...﴿٤١﴾﴾ الزمر.

ئانکو: مە پەرتووك ژبو تە فرێکریە خوارێ، ژبو خەلکی، ب حەق.

قورئان ژبو خەلکی یا هاتی، ژبو بەختەوەرکرنا خـەلکی، ژبـو وێ چـەندێ کو خەلك ب شێوەیەکی بژیت، کو بەختـەوەرێن دونیـایێ و سـەرفەرازێن ڕوژا دومـاهیێ بـن، ئـەڤجا ئـەم ژی د هـەرێما کوردسـتانێدا، دا بهـێین سیسـتەمێ حوکمڕانیێ، کو بەحسێ سیکولاریزمێ دکەت، و بەحسێ دیموکراسیێ دکەت، ل دادگەهێ بدەین و لسەر تەرازیێ دابنێین، ئەرێ مانە دهێتە گوتن: تاقیکرن باشـترین بەلگەهـە؟ دا بـزانین دێ چـەوا دەرکـەڤن؟ ل دەسـتپێکێ دا بەرێخودانێ ژبو سیکولاریزمێ بکەین:

## ســـــیكـولاریــزم

ل دەسـتپێكێ وەكـی ژبـەری نوكـە ژی مـن گـوتی، دبێـژم: د وەلاتـەكێ ئیسـلامیی دا، كـو خـەلك ژ ئیسـلامێ تێگەهشـتبیت، سـیكولاریزمێ بـەهانا هەبوونێ نینـە، چـونكی هـەمی ئـەو تشـتێن، كـو تـو د سـیكولاریزمێ دا لـێ دگەڕی، بێن دناڤ ئیسلاما تە دا هەین، ب شێوەیەكێ باشتر، و كومەكا كێم و كاسیێن مەزن و كوژەك د سیكۆلاریزمێ دا هەنە، وەكـی حسـێب نـەكرن ژبـو خودێ، و ڕوژا دوماهیێ، كو هەلبـەت ئیسـلامێ ئەڤـە ژی تێـدا نینـە، ئـانكو: ئیسلامێ هـەمی چـاكیێن سـیكولاریزمێ تێـدا هەنـە، و ژ خـرابیێن وێ ژی یـا دویرە، و بەلگەهێ من ژی ژبو ئەڤێ چەندێ "كو سیكولاریزم دناڤ موسڵمانێن ژ ئیسلامێ تێگەهشتی، بەهانا هـەبوونا وێ نینـە" ئەڤەیـە: بـەرێخودانێ ژبـو بـەرفرەهی و درێـژاهیا جیهانـا ئیسـلامی بكـە! بزانـە ل كیڤـە كومەلگەهـەكا موسڵمان، ئەو سیكولاریزم قەبوویل كریە، مادەم ژ ئیسـلامێ تێگەهشـتبیت؟ قەبوویل نەكریـە، و دبێـژم: ب لێبورینڤـە مەسـرەفەكا زور ب مـالێ و سـامانێ موسڵمانان ل سیكولاریزمێ هاتیە كرن، و پشتەڤانیا دەرەكـی ژی لـێ هاتیـە كـرن، بـەلێ هــەر ڕەوایــەتی (شــرعیة) پەیـدا نەكریــە، دگـەل نوكـە ژی، سیكولاریستێن مە ب شەرم و دبن لێڤانڤە، بەحسێ سیكولاریزما خـو دكـەن! بوچی؟ چونكی جهێ پێ وێ نینـە، چـونكی بـەهانا هـەبوونا وێ نینـە، مـانێ هەر چ تشتێ تو د سـیكولارێزمێ دا لـێ دگـەڕی، د ئیسـلاما تـە دا هەیـە، ب باشتر.

**پاشی دبێژم:** ئەو دەرئەنجامێن ئەرینی یێن سیکولاریزمێ د ڕۆژئاڤا دا هەین، دناڤ مە دا نینن، ئەز یێ بێ ئینصاف نینم، دبێژم ڕوژئاڤاییان، دەمێ هەوارا خو برە بەر سیکولاریزمێ، د واقعەکێ گەلەك دژوار دا خو دەربازکرن، و ژبو ژیانا دونیایا خو، کومەکا مفایان ژ سیکولاریزمێ وەرگرت:

١- مروڤ بوون و هاوولاتی بوون، کرینە پیڤەر، ئەوان ئەڤ چەندە کر، بەلێ ئەرێ لدەف مە وەسایە؟ نەخێر، بەلکو لدەف مە عەشیرەت و بنەماڵە و حزب، پیڤەرە، نەکو مروڤ بوون و هاوولاتی بوون.

٢- چەسپاندنا یەکسانیێ و دادگەرییێ، ل ڕوژئاڤا، هەتا ڕاددەیەکێ زور ئەڤ چەندە یا هاتیە کرن، بەلێ لڤێرێ سیکولارێزمێ، قورخکاری و گەندەڵی و برسیکرنا خەلکی و تێربوونا هندەکێن کێم، ژبو مە بەرهەم ئینایە.

٣- ل ڕوژئاڤا سیکولاریستان وەلاتێ خو ئاڤەدان کر، ژێرخانا ئابووری یا خو بەرەڤ پێشڤە بر، بەلێ لڤێرێ، ئەم دەیندار و نەدار و هەژارین.

٤- ل ڕوژئاڤا ب ئەگەرێ سیکولاریزمێ، "کو هەلبەت سیکولاریزمێ پەیوەندی ب ڤەکولینێن زانستی و ئازادیا عەقلی ژی هەبوو" زانست بەرەڤ پێشڤە چوو، و هونەرێ ئاڤاکەر ژی بەرەڤ پێشڤە بر، بەلێ لدەف مە ئاستێ زانستی بەرەڤ پاشڤە چوو، و هونەر و ئەدەب ژی، پتر د بوارێ خرابکرن و ئازراندنێدا، بکاردئینن!

٥- ل ڕوژئاڤا ب کریار، دین ژ ژیانی جوداکر، و دین ژ دەولەتێ جوداکر، دەست وەردان د کاروبارێن ئایینی دا نەکر، بەلێ بو من یا سەیرە، حزبەکا سیکولاریست، و حوکمەتەکا سیکولاریست، ئێکەتیا زانایان ژبو چییە؟ تو کارێ خو بکە، و مژویلی پێشڤەچوونا ژیانێ بە و ژێرخانا ئابووری ژبو وەلاتێ خو دابمەزرینە، ئەڤ تشتێن دی بوو چنە؟ بوچی لدور خو د ئالێنی؟ ئەگەر خو هوین د واقعی و ڕاست ژی بن؟! بوچی هوین وەك ڕۆژئاڤا ناکەن؟ هەر

چەندە وان ب فەرمی ئایینێ خو ژ دەولەتێ جوداکریە، بەلێ پێکولا وێ چەندێ ژی کریە کو ژ لایێ بهایێن ڕوحی و ڕەوشتێن ئاییێ خو مفادارین، لێ سیکولاریستێن مە، ژبلی وێ چەندێ کو بانگەشەیا سیکولاریزمێ دکەن لدەڤ ڕوژئاڤاییان، بانگەشەیا موسلمانەتی و دینداریێ ژی دکەن، بەلێ هەر ژ وی دەمێ سەرهلدان هاتیە کرن، "ل: ١٩٩١ ز دا"، ئانکو: چوارێکا سەد سالانە، هەتا ئەڤی دەمی ژ وێ چینا سیاسییا سیکولار یا حکومڕانێن مە، بتنێ ژبو جارەکێ ژی من ژ بەرپرسەکی گوهـ لێ نەبوویە، بەحسێ خودێ (جَلَّ وعلا)، بەحسێ پێغەمبەری (علیه الصلاة والسلام)، بەحسێ قورئانێ، بەحسێ ڕوژا دوماهیێ بکەت؟ هەتا هندی (باراك ئوباما)ی ژی بەحسێ ئاییێ خو " کو دبێژن: مە باوەری پێ هەیە" ناکەن، باراك ئوبامای گوت: (ئیسلام دینێ ڕەحمەتێیە، ئیسلام دینێ دادگەرییێیە، و ئەڤا داعش و گرووپێن توندڕەو دکەن، ئیسلام یا ژێ بەریئە)، لێ علمانی یێن ل دەڤ مە، شەرمە ل دەڤ وان بەحسێ دینێ خو بکەن، هەروەسا ئەم هەمی دزانین، دەولەتەك یا ل ڕوژهەلاتا ناڤەڕاست هەی، بناڤێ ئیسرائیل، کو بناڤێ ئێك ژ پێغەمبەران هاتیە بناڤکرن[1]، دەولەتەکا دینیە، و هەتا ڕادەیەکی دیموکراسی یە و زلهێزە ژی و دەستهەلات ژی هەیە[2]، بەلێ هەروەکی تو بێژی سیکولارێن مە بڕیارا دای، کو دانێ وان دگەل وێ ئیسلاما مە دا نەکەلیت! بەلێ، ئەها ئەڤەیە شێوەیێ سیکولاربوونا حزب و دەستهەلاتا سیکولاریستێن هەرێما کوردستانێ!

---

(١) چونکی (إسرائیل) نازناڤێ یەعقووب پێغەمبەرە علیه السلام، (إسرائیل)ژی واتە: (عبدالله).

(٢) لێ من ژ سیکولاریستێن مە گوهـ لێ نەبوویە، ڕەخنەیا دەولەتا ئاینی بوونێ، ل قەوارەیا جوهییان بگرن!

# ديموكراسى

هەروەكى ژبەرى نوكە مە گوت: ديموكراسى ب ڕامانا وێ چەندێ كو خەلكى ماف هەبيت د دانان و لێپرسينا بەرپرسان، و ڕادەستكرنا كارى ژبو وان، كەلەپورەكێ كەڤنێ بەشەرييە، و بەرنامەيێن خودێ، و پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ب قەناعەتا من دارێتنا وێ چەندێ بوون، كو خەلك ژێدەرێ دەستهەلاتێ بن، چونكى چ پێغەمبەرەك نەهاتيە، كو فيرعەونەكى بەرسينگێ وى نەگرتبيت، ژ ديتنا وێ چەندێ، كو لدەمێ پێغەمبەر هاتين: چينا خومەزنكەران و چينا خوشگوزەران، ئەوێن، كو هەر مژويلى وێ چەندێ بوون ب خوشييەكا نەدروست و هاى لايڤ بژين لسەر حسێبا خەلكێ هەژار و نەدار، ئەوان بەرسينگێ پێغەمبەران گرتيە، بوچى؟ وان زانى يە ب ئەگەرێ بەرنامەيێ پێغەمبەران، ئەو خوشى و بازارێ وان دێ خراب بيت و نامينيت، ئانكو: پێغەمبەر بێن هاتين، دادگەرييێ بچەسپينن، و گوتيە: دڤێت خەلك بتنێ بەندەيێ خودێ بيت، هەتاكو هندەك ژ وان لسەر هندەكێن دى نەبنە پەرستى و خودێ، خو لسەر وان نەكەنە فيرعەون و قارون.

و ب ديتنا من ل ئايەتا (٢٥)ێ ژ سورەتا (الأنبياء)، و ل ئايەتا (٢٥)ێ ژ سورەتا (الحديد)دا، كو بەحسێ ئێكتاپەرستيێ (توحيد) و بەحسێ دادگەريى (قسط) دهێتە كرن، بناغەيێ حوكمێ رەشيد، و خەلك كرنە ژێدەرێ دەستهەلاتێ (سلطة) هاتيە دارێتن، چونكى بێگومان لسەر بناغەيێ ئێكتاپەرستيێ (توحيد) و دادگەرييێ (عدل) ئەو چەندە دهێتە چەسپاندن، كو خەلك خودانێ دەستهەلاتێ بيت، و بەرپرسێن خو دابنێن، و چاڤدێريا وان

بکەن، و لێپرسینێ دگەل بکەن، و وان لابدەن لدەمێ ڕاست نەبن، ئەڤە ژی دەقێ وان دوو ئایەتێن پیروزە:

١- ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ٢٥ ﴾ الأنبياء.

ئانکو: و لبەری تە "ئەی موحەممەد" مە چ پێغەمبەرەك نەفرێکریە، ئیلا مە پێ ڕاگەهاندیە کو: ژبلی من چ پەرستیەك نینە، بتنێ من بپەرستن.

٢- ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ٢٥ ﴾ الحدید.

ئانکو: ب پشت ڕاستی: مە پێغەمبەر ب بەلگەهێن ڕوون فرێکرینە. و پەرتووك و تەرازی ژی دگەل فرێکرینە خوارێ، دا خەلك ب دادگەریێ برێڤە بچیت، و مە ئاسن ژی فرێکریە خوارێ، هێزەکا بهێز و گەلەك مفا ژبو خەلکی تێدا هەیە، و هەتاکو "د ئەنجامێ جیهادێدا" خودێ بزانیت کی ب بەرزەیڤە "چونکی ئەو خودێ نابینیت" خو و پێغەمبەرێن وی بسەردئێخیت، بێگومان خودێ یێ بهێز و زالە.

ئەڤجا هەروەکی مە ژبەری نوکە گوتی: ئەگەر مە ئاریشەیەك، دگەل دیموکراسیێ دا هەبیت، ئەوە کو حەلال و حەرامی دئێخیتە د دەستێ خەلکیدا، مە ب شێوەیەکێ بنەڕەتی، بتنێ ئەڤ تێبینیە لسەر دیموکراسیێ هەیە، چونکی دیارکرنا حەلالی و حەرامی، عایدێ خودێ یە، و پەرژانێ شوراییێ د ئیسلامێ دا شەریعەتە، بەلێ دیموکراسی یا بێ پەرژانە، لەوما دگەل ڕێزگرتنێ ژبو ئەڤێ کومبوون و مەجلسێ، نەچارم بێژم: دەمی دبینین

ل پەرلەمانێن ڕوژئاڤا خێزانێن هەڤڕەگەزی[1] ب یاسا دهێتە تەشریع کرن، و لدەمێ دزانین ل پەرلەمانێن وەلاتێن ڕوژئاڤا بڕیار دهێتە دان، کو وەلاتێ مە کوردستان، بهێتە پارچە پارچە کرن، و دەمێ مە گوهـ لێ دبیت ل وێرێ بڕیار دهێتە دان کو لەشکەرکێشی بهێتە کرن و وەلات بهێنە داگیرکرن، بلا لدەف مە یا سەیر نەبیت، چونکی دیموکراسیا وان، پەرژانەکێ وەکی شەریعەتێ ئیسلامێ نینە، کو دەستێ وان بگریت و ژ لادان و ستەمێ بدەتە پاش!

**ئەڤجا دا سەرنجێ بدەین!**

**کا ئەرێ دیموکراسی د هەرێما کوردستانێدا، چەوایە؟**

١- ئەرێ وەکی دیموکراسی دبێژیت: "بەلکو ئەڤە گرنگترین پێکهێنەرێ ئەرێنی یێ دیموکراسیێ یە" خەلك ژێدەرێ دەستهەلاتێ یە؟ یان حزب و هەتا حزب ژی یا مەزلومە، ئەز حزبێن سیکولاریست ب مەزلوم دزانم، چونکی ئەز هندەك ئەندامێن حزبێن حوکمڕان دنیاسم، یێ کەفتیە د لاحەولەوەلاییێ دا د دەستێ تشتەکی کو ژ حزبێ ژی بچویکترە، وەکی تاك و بنەماڵە و گرووپ، کو هەر حسێبێ ژی ژبو مەکتەبا سیاسی و حزبێ ناکەن، بلا ب دیتنا واقعی باخڤین.

٢- ئەڤجا ئەرێ وەکی دیموکراسی دبێژیت: د هەرێما مە دا یاسا سەروەرە یان حزب و ئاسایش سەروەرە؟ خەلکێ مە یێ هاتیە گرتن، پشتی هینگی ب قانونا وان، و حاکمێ وان دێ ئیفراج کەت، ئاسایش بەرنادەت! من جارەکێ گوتە کاك مەسعوودی، کاك مەسعوود! دێ ژبو تە سەلمینم، کو ئاسایش

---

(١) ئانکو: دوو نێر، دوو مێ، پێکڤە خێزانێ پێك دئینن!

سەرووەرە نەكو ياسا، گوتى: چەوا؟ من گوتىێ: مە كەسىێ وەسا يىێ هەى، ب ياسا دهێتە بەردان، ئاسايشا هەوە ناهێليت بهێتە مالێ.

٣- ئەڤجا هەلبژاردن، بێگومان هەلبژاردن تشتەكىێ باشە، بەلىێ ب مەرجەكى دەستەبەركرنا ئيرادەيا ڕاستەقينە يا خەلكى بيت، نەكو سەختەكارى و فشار ل خەلكى بهێنە كرن، و نەكو پلە و ئيمتيازات بهێنە دابەشكرن ژبو كڕينا ئيرادە و دەنگىێ خەلكى!

٤- ئەڤجا ژێك جوداكرنا دەستهەلاتان، بێگومان تشتەكىێ باشە، چونكى چڕكرنا دەستهەلاتىێ د دەستىێ كەسەكى، يان دامەزراوەيەكىێ يان دەزگەهەكيدا، دبيتە ئەگەرىێ خو سەپاندن (إستبداد) و قورخكارىيێ، بەلىێ مە وەكى خوارنىێ، هەمى تشت يێن تێكەل كرين، حوكمەت و حزب و عەشيرەت و بنەماڵە، هەمى يێن چوينە دناڤ ئێك دا، كەس چ ژىێ تێناگەهيت.

٥- ئەڤجا كارىێ ب دامەزراوەيى، كو ئێكا دى يە ژ بنەمايێن سيستەمىێ ديموكراسيىێ، بەلىێ كانىێ دامەزراوەيێن مە؟! پەرلەمانەكىێ ژ كار ئێخستى، حوكمەتەكا ئيفليج، سەروكىێ هەرێمىێ ژى ل دويڤ ياسايىێ ماوەيىێ وى يىێ ياسايى يىێ بسەرڤەچووى، لەوما ئەز نوكە دامەزراوەيەكا ب سەلامەت نابينم، د ئەڤىێ هەرێمىێ دا!

٦- ئەڤجا دابينكرنا ماف و ئازاديان، كو پێيەكىێ دى يىێ ديموكراسيىێ يە، دبێژم: ماف و ئازادى هەتا ڕادەيەكى يێن هەين، د هەرێما كوردستانىێ دا، بەلىێ بتنىێ ژ وى سنوورەيى و پتر ژى ئەو ماف و ئازادى، كو زيان ژبو پەزى نەبيت!

**ل دوماهییێ دبێژم:**

١- ب حوكمێ وێ چەندێ كو ئەز موسلمانم، ئیمان و عەقیدەیا مە یا لسەر من پێدڤی كری، كو دلسوز و دل ساخ بم، و ب خەم بم ژبو هەمی لایەكی ب گشتی، ب تایبەت ژبو خەلك و وەلاتێ خو، و د ڕابردووی دا د هەمی ئاستان دا، من چ ب باش زانیبیت و دیتبیت، ب دلسوزی و ب ڕوون و ئاشكەرایی من یا گوتی و ڕاگەهاندی، لەوما گەلەك ب ڕوونی و گەلەك ب ئاشكەرایی بەڕێزان! چینا سیكولاریستا كار بدەست ل هەرێما كوردستانێ! نە سیكولاریزما هەوە سیكولاریزمە، نە دیموكراسیا هەوە دیموكراسی یە، و ئەو بنەماییێن، ئەڤ دوویە ژێ پێكهاتین، ئەز چ ژ وان وەك پێدڤی نابینم، نە یێ بێ ئینصافم، بەلێ ژ خەم خوارن ژبو ئەڤی خەلكی و ئەڤی مللەتێ مە، كو هەوە هەتا نوكە ب وی شێوەی ئیدارەیا ئەڤی وەلاتەی كری، پشتی (٢٥) سالان پشتی چارێكا سەد سالان، لەوما لێزڤڕینێ ل خو بكەن.

٢- علمانییەتا هەرێمێ، وەكی خوارنێ، هەمی تشتەكێ تێدا: حوكمێ بنەمالەیی و میراتگرییێ، خو سەپاندن، پیروزكرنا دەستهەلاتێ، لەوما دبێژم: گونەهە ژبو هەوە چ دی ئەڤێ خوارنا خراب، ب ئەڤی مللەتێ خو نەدەنە خوارن، ئەگەر هەوە دڤێت هەر حوكمڕان بن، زادەكێ باش ژبو ئەڤی خەلكی دروست بكەن.

٣- خزمەتكرنا خەلك و جەماوەری، ئەركێ حكوومەت و دەستهەلاتێ یە، چ دی ب وان نەفروشن، ب بهایێ كڕینا دەنگ و ئیرادەیا وان.

**ئەڤجا دا دوو سێ ئاخفتنا ژی ژبەر وی مێڤانێ ژ فرەنسا هاتی[1]، ژبو رۆژئاڤاییان بكەین:**

١- سیكولاریزم و لائیكیزما هەوە، هەر چەند هوین یێن ژ كەنیسێ و ثیوكراسیێ دەرباز كرین، بەلێ هوین یێن توشی گەلەك دەرد و دەردەسەرییێن دیتر كرین، ژ تایبەت پوچگەرایی[2]، پاشی ئەو هندە بەسە، كو نوكە زانست یا د خزمەتا چەكێ كومكوژی و خوكوژییێ دا.

٢- دیموكراسیا هەوە ژی ب ئەگەرێ خوپەرستییێ: لیبرالیزم (Liberalism) و كاپیتالیزم (Capitalism) چ نەمایە بەروڤاژی خو ببیت، چ نەمایە ل جهێ وێ چەندێ كو حوكمێ خەلكی ژبو خەلكی بیت، یا دبیتە حوكمێ كەمینەیەكا پارەدار، لسەر خەلكەكێ نەدار و هەژار و بێ چارە دا، لەوما ئەگەر بهێتە گوتن: ل رۆژئاڤا كێ پارە پتر هەیە، دەنگێ وی بهێزترە، گەلەك راستە.

٣- واقعێ دژوار و تەپەسەركرنا گەلێ كورد، بەرهەمێ هزركرنا سیكولاریستانە، و بریارێن دیموكراسیا هەوە یە، هەوە ئینصافەك هەبیت، نە د جهێ خودا بوو ئەڤ مللەتێ مە هوسا وەكی گوشتێ خێرێ بهێتە دابەشكرن، ب داخ ڤە د پەرلەمانێن هەوە دا ب ئەڤی شێوەی بریار هاتە دان![3]

٤- ئەگەر هوین دیموكراسییەتێ ژبو خو باش دبینن، ژبو مە ژی باش ببینن، ئەم ژی مروڤین، ئەڤجا د هەلبژاردناندا، خەلكەكێ ئیسلامی بسەردكەڤیت،

---

(١) مەرەما من (پروفیسور میشێل ڤیڤیوركا) بوو.

(٢) پوچگەرایی، ئانكو: بێ ئارمانجی، فەلسەفەیەكا رۆژئاڤایی یە، كو ئایین و بنەمایێن وێ رەد دكەت و ب تشتەكێ پویچ دزانیت، ب عەرەبی دبێژنێ (العبثیة)، ب ئینگلیزی دبێژنێ (Ninilisn).

(٣) مەرەما من پەیمانا شووم یا (سایكس - بیكو) یە، كو ل سالا (١٩١٦ ز) دناڤبەرا فرەنسا و بریتانیا و رووسیا دا هاتە ئیمزا كرن، و ئێك ژ دەرئەنجامێن وێ دابەشكرنا كوردستانێ بوو.

بوچی هـوین رێکـێ ددەن، کو کودەتـا لسـەر بهێتـە کـرن، کـو ل جـەزائیر و فەلەستین و مسرێ، گەلەك ب ئاشکەرا یا دیار بوو؟

٥- هیڤی خـوازم کـو خـەلکێ رۆژئاڤـا ب تایبـەت سیاسـییێن وان، خەلـەتی و عەیب و کێم و کاسییێن گروپێن توندڕەو ب تایبەت (داعش)، لسـەر ئیسـلامێ حسێب نەکەن، چونکی ئیسلام دینێ سەماحەت و ڕەحمـەتێ یە، ئەڤـە بێن بوینە ئەگـەرێ سـەر ئێشـان و زەحمـەتێ، ژ سـەدێ نـووت و پێـنج (٩٥٪)ێ تەوژمێن ئیسلامی، هەڤسەنگن، بەلێ مە هندەك گروپێن تونـدڕەو هەنـە، کـو ئەو ژی ژبەر ئەڤی واقعێ نەخوش بێن پەیدا بووین.

٦- بلا چ دی ڕژێم و حزبێن سیکولاریست، مە ژ هەوە نەکەنە هەلامەت (ژبـو ترساندنێ)، و هەوە ب مە نەترسینن، کو دبێژنە هەوە: هوین ل پشتا مە بن، هەکە ئیسلامی جهێ مەترسییێ نـە!! نـەخێر، لایـەنێن ئیسـلامی پـتر دگـەل دیموکراسییێ ڕاست دکەن، ئەو لایەنێن ئیجابی، کو دگـەل شـەریعەتی هەڤـدژ نینن، و دگەل هەمی وان بنەما و بەهاییێن بلند و مروڤیدا، پتر ڕاست دکەن، و واقعێ ژیانا مە و کریارێن مە ژی د دیارن، مە چ جارا نەگوتیە ئەم مارکسی و چەپین، بەلکو ژیانەکا سـادە و ب نـەداری مـە یـا هـەیی، دگـەل مللـەتێ خـو دژیـن، و خــەلکێ دی ژی ئیـدیعایا چـەپییێ دکـەن، لـێ ب ژیانـەکا گەلـەك خوشـگوزەران دژیـن و ملیـاردێر و ملیـونێرن! گـرنگ ئـەوە ئینسـان دگـەل مەبـدەئێن خـو ڕاسـت بکـەت، ئەگەرنـە بـێ کریـار، درویشـمان چ ژێ هەلناوەرییێت.

٧- ئیسلام و موسڵمانان ئاستەنگ و ئاریشە دگەل حزب و ڕژێمێن خوسەپین و دیکتـاتور هەیـە، نـەکو دیموکراسـییێ، ژبلـی مەسـەلەیا دیارکرنـا حـەلالی و حەرامی.

# دەستپێك

گەلەك سوپاسیا كاك مەلا بەختیاری دكەم، هەر چەند من هەست ب وێ چەندێ كر، كو پتر ئەم زڤڕاندین ژبو دیروكێ، من حەز دكر پتر لسەر واقعی باخڤیت، هەروەكی من بەحس ژێ كری، چونكی هندیكە سیكولاریزمە، هندیكە دیموكراسی یە، هندیكە سیستەمێ حوكمڕانیا ئیسلامی یە، ژبو وێ چەندێ یە كو د واقعی دا بهێتە دەستەبەركرن، ب دیتنا مە ئیسلام بەدیلە ژبو سیكولاریزمێ، و لایەنێن ئیجابی یێن دیموكراسیێ تێدا هەنە، و ناكوكی ژی نینە دگەل پتریا بنەماییێن وێ، وەكو میكانیزمێ حوكمڕانییێ، لێ ئیسلام بەدیلە ژبو سیكولاریزمێ، خەلكێ ڕوژئاڤا نەچار بوون هەوارا خو ببەن ژبو سیكولاریزمێ، بەلێ خەلكێ مە ب هیچ ڕەنگەكی نە یێ نەچارە، چونكی هەر چاكیەك د وێ دا هەبیت، یا د ئیسلاما وان دا هەی، ب شێوەیەكێ باشتر، و ژ خرابی و خالێن وێ یێن نەرێنی ژی یا دویرە، لەوما من پێ خوش بوو، پتر لسەر واقعی باخڤیت، ب هەر حال ئەڤە ژبو وی دزڤڕیت.

بەلێ ئەز پێگیر بووم ب ناڤ و نیشانێ دیبەیتێ: (سیكولاریزم و دیموكراسی د ئەزموونا هەرێما كوردستانێدا)، د ئەڤی چوارچوڤەیدا من پێكول كرن باخڤم.

هەلبەت كاك مەلا بەختیاری چەند تشتەك ئازراندن، ئەز دێ بلەز لسەررا بورم:

**ئێكەم: دبێژیت: خوزی بەحسێ خەلەتیێن ئیسلامییان كریا؟**

**بەرسڤ:** ب تەئكید بەحس نە بەحسێ ئیسلامییان بوو، بەلكو بەحسێ سیكولاریزم و بەحسێ دیموكراسیێ بوو، لەوما دڤیابا هەر بەحسێ ئەڤان بكەم، بەلێ ئەگەر ئەم ڕوینشتباین لسەر وێ چەندێ كو بەحسێ دەولەتا ئیسلامی و تەوژمێ ئیسلامی و ئیسلامییان، كو ئەرێ چ ڤێ هەیە، ل وی دەمی دا بەحسێ كێم و كاسیێن ئیسلامییان ژی كەین، ب تەئكید ئیسلامی فریشتەییێن بێ خەلەتی و بێ كێماسی و عەیب نینە، بەلێ بەحس ئەڤ بەحسە نەبوو، و ئەز سوپاسیا ئینصافیا كاك مەلا بەختیاری دكەم، كو گوتی: من چ خواریەك دگەل ئاخفتنێن ماموستایی نینە، و گەلەك كێم و كاسییێن دیتر ژی یێن هەین، ئاخفتنێن پتر هەلدگرن و ژبو دڤێن، لەوما ئەم ژی دێ وان ئاخفتنێن زور ژبو وەختەكێ دی هەلگرین[1]، ڕاستە ئەوا مە لدور واقعێ هەرێمێ گوتی، پتر ئاخفتن ژبو دڤێت، و ب حەقیقەت دەمێ ئەز بەحسێ كێم و كاسیێن مە دكەم، د ئەڤێ هەرێما كوردستانێ دا، وەكی كەسێن پێشین دبێژن: (دوست ئەوە یێ تە بگرینیت، دوژمن ئەو كەسە یێ تە دئینتە پێكەنینێ)، ب دیتنا من دڤێت دلسوزیا مە ژبو هەرێما مە، و ئەزموونا مە، ژبو خەلك و جەماوەرێ مە، جورئەتا وێ چەندێ بدەتە مە، كو خالا بدانینە سەر پەیڤان، تبلا دەستێ خو بدانینە لسەر نەخوشیان، ئەگەرنە ژبەر خاترگرتنا هەڤدوو و موجامەلێ، مە چ پێ چێنابیت و چ ناهێتە كرن.

هەروەسا ئەو چینا سیاسی یا حوكمڕان ل هەرێما كوردستانێ ژی، پتریا وان دوست و نیاسن، و ئەز ب باش نزانم خو ژ كەسێ بڤەقەتینم، ئیلا ئەگەر كەسەك دەرگەهی لسەر مە بگریت و خو ژ مە بڤەقەتینیت، ئەگەرنە من

---

(١) د پەرتووكا: (ڕوانینێكی ئیسلامییانە بوٚ واقعیی ئێستامان) مە ب درێژی لدور وی بابەتی ئاخفتیە.

باوەری ب ڤەقەتیانێ نینە، و من باوەری ب نە ئاخفتنا دگەل ئێك نینە، لەوما گەلەك جاران من ڕولێ هەبویە، کو دوو لایەنێن ناکوکێن علمانی دگەل ئێك ئاشت بکەم، چونکی ئەگەر ب مە هەمیا تشتەك بهێتە کرن، دێ هێتە کرن، ئەگەر نە ب ژێك جودابونێ و پشت دانا هەڤدوو، چ ب مە ناهێتە کرن.

**دووهەم: کاك مەلا بەختیار دبێژیت: ئەمێن علمانی نەبووین مە مەککەهـ هەڕفاند؟**

**بەرسڤ:** من بەحسێ ئەڤێ چەندێ نەکریە، ئەگەر وی دڤێت بەرسڤا من بدەت، من بەحسێ ئەڤێ چەندێ نەکریە، ئەز هوسا دبینم ئەو یێ بەرسڤا ئاخفتنەکێ ددەت، کو من نەکریە؟

**سێیەم: دبێژیت: سێ خەلیفەیێن ڕاشدی یێن هاتینە کوشتن، و بنەمالا پێغەمبەری (علیه الصلاة والسلام)، و (حسین) یێ هاتیە کوشتن و ستەم یا لێ هاتیە کرن؟**

**بەرسڤ:** ڕاستە، ئەو هەمی د خراب بوون، بەلێ خو من خەلکێ علمانی ب وێ چەندێ تومەتبار نەکریە!! ئەڤجا سێ خەلیفەیێن ڕاشدی کو دهێنە کوشتن، ب ڕاستی ئەڤە خالا بهێزە ژبو ئیسلامێ، چونکی کەلتورێ وی دەمی یێ حوکمڕانیێ، د هەمی وەلاتێن دونیایێدا، و پاشکەفتنا کومەلگەهێ، تەحەمولا هزرا حوکمێ ڕاشدی نەکر، چونکی د سەردەمێ حوکمێ خەلیفەیێن ڕاشددا، خەلك هەمی یەکسان بوون، و خەلکی دناڤبەرا خودا کی باشتر دزانی، و کی پتر خودان کەفائەت بوو، ئەو دکرە بەرپرسێ خو، بێ گوهدانە بنەمالێ و ئیجاخ و ڕەگەز و پارە و سامان و وەجاهەت و ئەڤانە، بەلێ د ئەنجام دا هندەك کەسان کو چاڤێ وان ل قورخکاریێ و ستەمێ بوو، نەشیان تەحەمولا ئەڤا هەنێ بکەن: ئومەویی هاتن کودەتا لسەر خەلیفەیێن ڕاشددا کر، ئەڤە

ژى فەرموودەيا پێغەمبەرى يە (صلى الله عليه وسلم) دەمىٚ كەرەم دكەت و دبێژيت: {أَوَّلُ مَنْ يَغَيِّرُ سُنَّتِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ} (أَخْرَجَه ابْنُ أَبي عَاصم في (الأوائل) (ج٧، ص٢)، قَالَ الألباني: وَهَذَا إِسْنَادٌ حَسَنٌ، رِجَالُهُ ثِقَات رِجَالُ الشَّيْخَيْنِ غَيْر المُهَاجِر وَهُوَ ابْنُ مُخَلَّد، وَلَعَلَّ المُرَاد بالحَديث تَغيير نِظَام اختيَار الخَليفَة وَجعله وراثة)، واتە: ئێكەمين كەس كو رێك و شوينا من دگوهورِيت (واتە: رێك و شوينا حوكمرانيىٚ) زەلامەكە ژ بەنى ئومەييە، كو ئەلبانى دبێژيت: رەنگە مەرەم پىٚ دانانا شێوازىٚ دانانا خەليفە و حوكمرانى بيت، كو ژ مشێورەتىٚ، هاتە گوهورين ژبو ميراتى و بنەمالەييىٚ.

د ڤێرىٚ را ئينحيراف يا پەيدابووى، بەلىٚ، ئەم دزانين، كو خەليفەيێن راشد بێن هاتينە كوشتن، و زانايێن ئيسلامىٚ بێن هاتينە زيندان كرن، بەلىٚ ئەڤە خالا هێزىٚ يە ژبو ئيسلامىٚ، و خالا هێزىٚ يە ژبو زانايێن ئيسلامىٚ، كو نە د بەرهەڤ بون تەنازلىٚ بكەن لسەر مەبدەئێن خو، دگەل دەستهەلاتداران، نوكە ژى هەر ئەڤە يا ژ مە هاتيە داخوازكرن، هەر ئەڤە ژ ماموستا و رەوشەنبير و نڤيسەران هاتيە داخوازكرن، كو ب دەڤ چەوركرنەكىٚ و چێكرنا تەماعييەكىٚ، و ب دوو فشار و هەرەشەيان، تەنازلىٚ ژ مەبدەئێن خو نەكەين، و ئەوا كو ب راست و چاك دزانين ژبو مللەتىٚ خو بێژين، و پێداگيرييىٚ بكەين لسەر وىٚ چەندىٚ كو دڤێت ئەڤ وەزعە راستبببيتەڤە، و چاكسازى و پاكسازى تێدا بهێتە كرن.

ئەڤجا زانايێن ئيسلامىٚ ژى هەر هوسا بوينە: ئەحمەدىٚ كورىٚ حەنبەلى كو (ژ بوچوونا خو لدور قورئانىٚ) تەنازلىٚ ناكەت ، شافيعى ، كو (ژ عيراقىٚ) دهێتە دەرئێخستن ، مالك كو (لسەر پشتەڤانيا راپەرينىٚ ل دژى حوكمرانێن ستەمكار د سەردەمىٚ خو دا) دهێتە قوتان، دڤێت لسەر ئەڤىٚ، مەدالياێن

شەڕەڤێ ب ئەڤان ڤە بهێتـە هەلواسـین، و ئەڤـە نیشـانێ سـاخیا ئیسـلامێ، و نیشانێ ڕەسەنایەتیا وان زانایان بویە (ڕازیبونا خودێ لسەر وان بیت) .

**چوارەم: ب نسبەتی هەردوو جەنگێن جیهانی کو بەحس ژێ کرن.**

**بەرسڤ:** ئەژی پشتەڤانیا وی دکـەم، د جـەنگێ جیهـانییێ ئێکـێ، و جـەنگێ جیهانییێ دوویێ دا، ل دویڤ هندەك سەرژمێریان، نزیکی (٧٠) ملیون کـەس پتر، کێمتر، هاتینە کوشتن، بەلێ کوشتییێن هەمی جـەنگێن عالـەما ئیسـلامی کوم بکەی، ل وی دەمێ، کو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەبوویە، هـەتا دومـاهیێ، نیڤـا نیڤـا ئـەڤان نـابن، و هـەمی کوشـتییێن جـەنگێن سـەردەمێ پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) ناگەهنە هزار (١٠٠٠) کەسان.

**پێنجـەم: ئـەوا کـو گەلـەك سـەرنجا مـن ڕاکێشـا، ئـەو بـوو کـو گازنـدە ژ صەلاحەددینێ ئەیوبی کر، کو حوکمێ فاتیمییان ل مسرێ نەهێلایە؟!**

**بەرسڤ:** دوماهیك خەلیفێ فاتیمی (العاضد) کو هەزانڤانەك دبێژیتێ: (فَاحْكُمْ فَأَنْتَ الوَاحِد القَهَّارُ)، واتە: حوکمی بکە تو تاکە کەسی کو خەلك ملێ خو ژبو تە بدانن و بکەڤنە دبن دەستهەلاتا تە، کو ئەڤە ثیوکراسییەکا گەلـەك خـراب بوویـە[1]، و بـەرێ خـو دایـە خـەلکی وەکـی کـویلا، و حـوکمێ فاتیمییـان حوکمـەکێ شـیعی یـێ تونـدڕەو (متطـرف) و تـائیفی بوویـە، هەروەسـا مـە صەلاحەددینێ هەی، کو شانازیێ پێ دکەین، ئـەڤجا ژبـەر هنـدێ ڕەخنـە لـێ بهێتە گرتن، کو حوکمەکێ تائیفی و دەمارگیر و خراب نەهێلایە، ب دیتنا مـن ئەڤە بێ ئینصافی یە ل بەرامبەری صەلاحەددینی.

---

(١) هەتا ئەو ئاخفتن ب کوفر و شرك دهێتە دانان.

**شەشەم: ب نسبەتی کوشتنا خەلیفەیێن عەباسی، گەلەك ئاخفتن کرن.**

**بەرسڤ:** بەلێ، ئەم ژی دزانین کو د دیروکا موسلمانان دا، گەلەك کێم و کاسی هەبوینە، بەلێ ئەو کێم و کاسی دزڤرن ژبو لادانا وی خەلکی ژ ئیسلامێ، بەلێ یا نەصرانییان دزڤریت ژبو دینێ وان بخو ئەوێ هاتیە تێکدان، ژبو پەرتووکا پیروز بخو، کو هاتیە تێکدان، ئەگەر نە ئەو پەرتووکا خودایێ مەزن فرێکری، ب وی شێوەیی نەبوویە.

**حەفتەم: ب نسبەتی علمانییەتێ، کو بهێتە گرێدان، ب کوشتنێڤە.**

**بەرسڤ:** بەروڤاژیی، من گوتی: کەنیسا نەصرانیەتێ ، کوشتن کر، کەنیسێ دادگەها تەفتیشێ دانا، پاشی علمانی هاتن و لبەر سینگێ وێ ڕاوستیان و ڕەدکر، و علمانییان و بزاڤێن علمانی باجێن مەزن دان و هاتنە سوتن، من هوسا گوت، بەلکی ب شێوەیەکێ باش د ئاخفتنا من نەگەهشتبیت.

**هەشتەم: گوتی: علمانییەت دگەل ئیلحادێدا نینە.**

**بەرسڤ:** من ل دەسپێکی گوتی: دناڤ علمانییان دا بگەڕیێ، دێ بینی: خەلکێ خودێ نەنیاسن و مولحد تێدا هەبوینە، و خەلکێ خودێ نیاس ژی تێدا هەبوینە[1]، هەلبەت مە تێبینی ژ ئەڤێ جورێ خودێ نیاسیێ ژی هەیە، کەسەك دبێژیت: ئەز خودێ دنیاسم، خودێ حەقە، بەلێ دینێ وی بکێرناهێت!! ئەڤە دبیت چ جورەکێ خودێ نیاسیێ بیت، ئەڤێ دبێژنێ: (نە یێ لەنگە، بەلێ پێ وی یێ شکەستی)! دەمێ تە باوەری ب خودێ هەبیت، کو خودێ قورئان یا فرێکری، و پێغەمبەرێ فرێکری، و هەردوو ژبو هەمی بەشەرا هاتینە فرێکرن، چەوا دێ بێژی: ئەی خودێ! دینێ تە بکێرناهێت؟ و

(١) خودێ نیاسن (معتقد بالله) ژ: باوەردار ب خودێ (مؤمن بالله) جودایە، بو نموونە: ئبلیسی گەلەك باش خودێ یێ نیاسی، بەلێ باوەردار (مؤمن) نەبویە.

چەوا ئەوا خودێ حەلال کری، تو ب حەلال نادانی، و ئەوا ب حەرام دانای، تو ب حەرام نادانی، بێگومان ئەڤە دگەل ناڤێ موسلمانیدا ناگونجیت، کو تو موسلمانی، موسلمان (مسلم) ئانکو ملکەچ ژبو خودێ، لەوما ئەوا کو خودێ فرێکری، دڤێت لدەف تە یا قەبیل کری بیت، دێ شێی بێژی: من قەبیل نینە، ل وی دەمی نە موسلمانی و خلاس، بەلێ تو کو موسلمانی، دڤێت بێژی: مادەم خودێ کەرەم کریە و گوتیە، و گەهشتیە مە، من قەبیلە، ب جوانی دڤێت بسەلمینی و ملکەچ بی.

**نەهەم: ب نسبەتی ئەوا کو دڤێت عەقلێ ئینسانی چەق (سەنتەر) بیت، و عەقلێ ئینسانی دڤێت یێ ئازاد بیت!**

**بەرسڤ:** ئەم ژی هەر وەدبێژین، ئەسلەن زانایێن ئیسلامێ دبێژن: (العَقَلُ مَنَاط التّكْلِيف)، تەکلیف یا هاتیە گرێدان ب عەقلیڤە، کەسێ دین تەکلیف لسەر نینە، زاروکی تەکلیف لسەر نینە، بوچی؟ چونکی عەقلێ وی کامل نەبوویە، یان عەقل نینە، و د ئیسلامێ دا گەلەك گرنگی ب عەقلی هاتیە دان، و هەر موعتەزیلە نەبوون، کو گرنگی دایە عەقلی، بەلکو هەمی دانوستاندن و داخویانی و پەیڤین (خطاب) ێن قورئانێ، بەرێ وان یێ ل عەقلمەندان، بو نموونە: خودێ کەرم دکەت و دبێژیت:

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ۝٢ ﴾ يوسف.

هەروەسا دبێژیت:

﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ۝٢٤٢ ﴾ البقرة.

ئانکو: هەر کەسێ عەقل نەبیت، قورئان هەر ڕوویێ خو نادەتێ، قورئان دانوستاندنێ دگەل ناکەت و چ داخویانیان ژبو نادەت، قورئان دانوستاندنێ

دگەل عاقلان دكەت، قورئان دانوستاندنێ دگەل وان كەسان دكەت، كو ژێ تێدگەهن و كەسێن فاما و شارەزانە.

**دەهەم: ب نسبەتى ئەوا گوتى: ئەم هەمى ژ تازەگەرییێ و مودێرنێتێ (حداثة) مفادارین.**

**بەرسڤ:** ڕاستە، بەلێ ئەرێ مودێرنێتە (Modernita) ب شەڤ و ڕوژەكێ پەیدابوویە؟ ئەرێ ئەو مودێرنێتە وەكى كڤاركەكێ بوویە، هەر ژ خو پەقى یە، پشتى تاڤەكا بارانێ؟ نەخێر، مودێرنێتە، كەلتور و كەلەپورێ هەمى بەشەرایە، د دەمێ خودا ل دەف هندییان بوویە، پاشى یونانیان یا لسەر زێدەكرى، پاشى مسرێ، پاشى میزوپوتامیا یا لسەر زێدەكرى، پشتى ڕومییان، پاشى دەولەتا ئیسلامى، ژ ئەنجامێ لسەر ئێك خڕ بوون (تراكم) و كومبونا هەمیان، ئەو تەكنولوژیا و مودێرنێتە پەیدابوویە، یا كاك مەلا بەختیار! نابیت دانپێدانێ ب وێ چەندێ بكەت، كو ڕوژهەلاتناسان ژى دانپێدان پێ كریە، كو پشتى شەڕێ خاچ پەرێسان، و پشتى وەرگێڕانا پەرتوكێن ئبن ڕوشد و پەرتوكێن زانایێن دى، ڕێنیسانس ل ئەوڕوپا سەرهلدا؟ لەوانێ: ئەڤە میرات و كەلەپورێ هەمى بەشەرایە، ئەڤە بتنێ ئەوڕوپا خودانێ وێ نینە، نە یونان و نە گریك و نە موسڵمان و نە هند و نە چین، بەلكو یا هەمى بەشەرایە، چونكى تەكنولوجیا و شارستانیەت دهێتە ڕادەست كرن، جارەكێ ل وێرێ بوویە، و جارەكێ ل وێرێ، بەلێ نوكە حالەتەكێ عەولەمەیى یێ گرتى، ناهێتە ئینكاركرن، كو ئەوڕوپیان گەلەك لسەر زێدەكر، بەلێ وان ژى ژ سفرێ دەست پێ نەكریە، بەلكو پەرتوكێن زانایێن موسڵمان وەرگێڕان، و موسڵمانان ژى د دەمێ خودا پەرتوكێن یونانیان وەرگێڕان، ئەڤە ژى وێ چەندێ دگەهینیت كو ئیسلامێ چ خواریەك نینە كو مفایى ژ ئەزموون و هزرا هەر كەسەكى وەربگریت، بەرهەم و

پەرتوکێن نەموسڵمانان ژی، مادەم موسڵمان ژێ د مفادارن، ئیسلام دەستێ وان ناگریت کو مفای ژ حیکمەت و زانستێ هەر کەسەکی وەربگرن[1] .

ب دیتنا من کاك مەلا بەختیار گەلەك چوو دناڤ دیروکێ دا، ئەگەرێ وێ ژی ئەو بوو، وەك پێدڤی بەرەڤانی ژ ئەڤی واقعەی پێ ناهێتە کرن، ئەڤ واقعێ، کو هەلبەت خەلکێ ئیسلامی د هەرێما کوردستانێ دا پەیدانەکریە، بەلکو ئەڤ واقعە حوکمڕانێن سیکولاریست یا پەیدا کری، ئەڤجا ژبەرکو د وێ جەبهێ دا هەست ب زوعفێ دکر، بازدا ژبو کویراتیا دیروکێ، کو بابەتێ مە بابەتێ دیروکێ نەبوو.

**یازدەهەم: کو دبێژیت: دیموکراسی ژ کەنگی وەرە سەرهلدایە؟**

**بەرسڤ:** من گوتی: پەیڤا دیموکراسی بەلێ یا ژلایێ یونانیانڤە هاتی، بەلێ ناڤەڕوکا دیموکراسیێ نە، ئەڤجا وەکی زانا دبێژن: (العبرة بالمحتويات والمضامين، وليست بالأسماء والعناوين) واتە: جهێ سەرنج و پەند وەرگرتنێ ناڤەڕوك و مەرەمن، نەکو ناڤ و نیشان، ئەڤە ناڤەڕوکا دیموکراسیێ یە، کو خەلك ب گشتی خودانێ دەستهەڵاتێ بن، ئەڤجا ئەز دبێژم: ئا ئەڤە کەڤنترە ژ یونان، پاش خو مەعقول نینە، بێژی: هەتاکو یونانی ژدایك نەبوون، خەلکی عەقل نەبوویە، خەلکی عەقل و فیترەتا ساخ هەر هەبوویە، بەشەر هەر بەشەر بوویە، هەروەکی چەوا ئەزموونێن شکەستی د حوکمڕانیێ دا هەبووینە، ئەزموونێن سەرکەفتی ژی هەبووینە، و من ئیشارەت ب چەند پەرتووکێن دیروکێ کر، کو هەر ئەوروپیان بخو نڤیسینە.

---

(١) د شینوارەکی (أثر) دا هاتیە: (الحكمة ضالة المؤمن فحيث وجدها فهو أحق بها) أَخْرَجَهُ التِّرمذِيُّ برقم: (٢٦٨٧)، وَقَالَ: غَرِيب، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٦٩)، واتە: حیکمەت ئەو تشتە یا ژ باوەرداری بەرزەبوی، ل هەر جهەکی ببینیت بو وی ژ هەر کەسەکێ دیتر هەژیترە.

**دوازدەهەم: و دبێژیت دیموکراسی نه ئەوه کو خودێ بهێته لادان!**

**بەرسڤ:** ئەژی نابێژم دیموکراسی ئەوه، کو خودێ بهێته لادان! بەلێ دبێژم: دیموکراسیێ چوارچوڤەیەك نینه، وێ بپارێزیت، ژ گوتنا تشتەکی کو دگەل شەریعەتێ ئیسلامێ هەڤدژ و بەروڤاژی بیت، ژبو مه موسلمانان، ئەگەرنه ژبو کەسەکێ نه موسلمان، ژبو کەسەکێ ڕوژئاڤا حەقێ وی یه، بەلێ ل دەف مه موسلمانان: ڕیبا حەڕامه، زینا حەڕامه، کوشتن حەڕامه، دزی حەڕامه، نڤێژ واجبه، ڕوژی واجبه، عەدل واجبه، زولم حەڕامه، و ئەو تشتێن خودێ واجب کرین، واجبن، هەتا ڕوژا قیامەتێ، و ئەوێن کو خودێ قەدەغه ژی کرین، قەدەغەنه، هەتا ڕوژا قیامەتێ، ئەم وەکو مللەتەکێ موسلمان، دڤێت ب چوارچوڤەیێن شەریعەتیڤه د پێگیر بین، چونکی شەریعەتێ خودێ، چ تشتەك قەدەغه نەکریه، ئیلا ژبو تاك و کومێ و دونیا و قیامەتێ، یێ خرابه، و چ تشتەك واجب نەکریه، ئیلا ژبو تاك و کومێ و دونیا و قیامەتێ، یێ باشه.

**سێزدەهەم: دبێژیت: دەولەتێن ئیسلامی ئاخفتنا خێرێ نەکریه، ژبو مه مللەتێ کورد دەمێ ڕژێما بەعس ئەم قەتل و عام دکرین!**

**بەرسڤ:** ئەو دەولەت[1] هەر ئەو ڕژێمێن ستەمکار و خوسەپین بوون، کو ئیدیعایا سیکولاریستیێ دکەن، و ئیدیعایا دیموکراسیێ دکەن، بەلێ کابوسن لسەر سەرێ خەلکیڤه، ئەرێ ل سەردەمێ ڕژێمێ، بوچی مه وەلاتێ خو هێلا و چوینه چیای، چونکی ڕژێمێ ڕێك نەددا کەس نەفەسێ بدەت، ڕێك نەددا کەس چوار ئاخفتنا بێژیت.

---

(١) کو ئەو ب دەولەتێن ئیسلامی ناڤێ وان دئینیت.

**چواردەهەم: هەروەسا بەحسێ بێ هەلویستیا لایەنێن ئیسلامی کر لدور وی بابەتی.**

**بەرسڤ:** ب دیتنا من ناچێبیت گازندە ژ ئیسلامییێن بێ چارە و بێ دەستهەلات بهێتە کرن، کو د کونجا زیندانانڤە بوون، ل مسرێ، و ل کیڤە و کیڤە، و نوکە ژی هەر یێ دناف کونجا زیندانێ دا، پشتی کو متمانە ژ خەلکی و جادێ وەرگرت، (عبدالفتاح سیسی) دەمێ کودەتاییێ دکەت لسەر شەرعییەتێ و ئیرادەیا جەماوەرەکێ پتریا وان موسلمان، تو گازندەیێ ژێ ناکەی، هەر چەند دیموکراسی یا بن پێ ژی کری! بەلێ گازندەیێ ژ (محمد مرسی) دکەی! گازندەیا چ ژێ دکەی، کو ژبەری نوکە ژی د زیندانێ ڤە بوویە، نەشیایە بەرەڤانییێ ژ تە بکەت؟! و ئەگەر د ڕابردوویدا کێم خەمی و خەمساری ژی هەبیت ژلایێ وان ڤە، خەمساری هەر خەمساری یە، بەرەڤانییێ ژ خەلەتیێن چ کەسەکی ناکەم، چونکی بێگومان ستەمکاریەکا مەزن یا کەفتیە لسەر مللەتێ مە، دڤیابا بەرەڤانی ژ مە کریا، بەلێ کەسەك د زیندانێ ڤە بیت و دەرفەتا ئاخفتنێ نەبیت، گازندەیا چ ژێ بکەم، ئەڤجا ئیخوان بیت، یان سەلەفی بیت، یان هەر کەسەکێ دی بیت!

**پازدەهەم: و بەحسێ مقاوەمێ کر، گوتی: ئەم بووین کو مە مقاوەمە کری.**

**بەرسڤ:** ئەڤ ئاخفتنە ڕاستە و نکولی لێ ناهێتە کرن (ب تایبەتی ئێکەتیا نیشتیمانی) هەر چەند ئەم وەکو ئیسلامی درەنگ ڤێرا گەهشتین، بەلێ پاشی مە ژی مقاوەمە کر، تشتەکێ باش مە کر، بەلێ من نەزانی ئەڤێ چ پەیوەندیەك ب بابەتێ مە ڤە هەبوو، ئەگەر نە هەر لایەك ژ مە کو ل دژی ڕژێما بەعس شەڕ کری و مە بەرگری ژ خەلك و ئاخا خو کری، تشتەکێ باش مە یێ کری، نوکە ژی ئەز ل ڤێرێ ڕێز و تەقدیر و سوپاسیێ ژبو وان برایێن مە یێن پێشمەرگە فرێدکەم، کو ل سنورێن کوردستانێ مە دپارێزن، و ئەم

ژى هوسا ب ئارامى دشێين ئاخفتن و بەحسێن خو بكەين، ب حەقيقەت جهـىٚ هەمى رێز و تەقديرەكىٚ نە، بـەلىٚ ئـەرىٚ ئـەو پێشـمەرگە يێن كێنـە ؟ ئەگـەر ئێكەتى و پارتى دبێژن: بتنىٚ يێن مە نـە، واتـە: ميليشـيانە[1]، دڤێـت بێـژن: يێن هەمى لايـەكى نـە و يێن هـەمى خـەلكى نـە، بـەلىٚ ، ژبـەر هەسـتييارىیٚ هنـدەك لايـەنێن علمـانى، رێـك نەهاتـە دان، كـو خەلكـەكىٚ ئيسـلامى ژى ب رێژەيەكا باش پشكدار بيت، نوكە ژى (الحمدلله) گەلـەك ژ پێشـمەرگەيێن مـە نڤێژا دكەن ڕوژيا دگرن، بەلىٚ هەكە رێك هاتبـا دان و دەرفـەت پەيدابيا ئـەم ژى وەك كومەلا ئيسلامى، كو ژبەرى نوكە مە هێزەكا چەكدار يا باش هەبوو، نوكە ئەگەر ئەو ژى دناڤ هێزا پێشمەرگەيدا بان، ب پشت ڕاستيڤە دا جـەبهىٚ مە بهێزتر بيت، ب تايبەت ل بەرامبەر داعشەكى، كو ب ناڤىٚ ئيسلامىٚ شەڕى ب مـە دفروشـيت، و بـەلا خـو ل ئـەڤىٚ هـەرێمىٚ ددەت، و ب ڕەسمـى چـەند جارەكا مە داخواز ژ جەنابىٚ مەسعوود بارزانى كر، و وەكو مەكتـەبا سياسـى مە داخواز ژ لايەنێن سياسى كر، كو بلا ئەم ژى دناڤدا بين، بەلىٚ ب هەر حال دەرفەت نەهاتە دان، دگەل ئەڤىٚ چەندىٚ ژى مە چ ئاريشەك نينـە، و ئەوێن ل وێرىٚ ژى برايێن مە نە خودىٚ وان بپارێزيت، ئەم ب هەمى لايەكى دشێن ئەڤى وەلاتەى بەرەف پێش ببەين، و بپارێزين، چ ل بەرەيێن شەڕى، چ ل ڤێرىٚ كو دەستىٚ خو بدانينە لسەر كێم و كاسيان، و چارەسـەر بكـەين، و پاكسـازى و چاكسازيێن وەسا بكەين، كو جەماوەرىٚ مە، و خەلكىٚ مە پتر بـاوەردار بيـت ب واقعىٚ مە يىٚ سياسى.

---

(١) واتە: ئەگەر پارتى و ئێكەتى بێژن: ئەو هێزا پێشمەرگەيى بتنىٚ يا مە يە، مەعنا وىٚ ئەو ب ميليشيا يێن حسێب كرين، چونكى هەر هێزەكا چەكدار يا سەر ب حزبێڤە، ميليشيايە !

**شازدەهەم[1] : ئەرێ ماموستا عەلى باپير! هوين چ جورە علمانييەتەكێ ڕەد دكەن؟**

**بەرسڤ:** ئەو پرسيارا جەنابێ تە كو: چ جورە علمانييەتەكێ ڕەد دكەين؟ ڕەدكرن دوو جورە:

١- ڕەدكرنا نەهێلانێ و ڕێك پێ نەدانێ: ئەڤە ئاخفتنا من نەبوو، بەلكو ئاخفتنا كاك مەلا بەختيارى بوو، كو عەلەساس من يێ گوتى: جهێ سيكولاريزمێ دناڤ موسڵمانانىدا نينە!! من وەسا نەگوت، من گوت: دناڤ كومەڵگەهەكێدا كو ژ ئيسلامێ تێگەهشتبن، چ بەهانە و هێجەتەك ژبو هەبوونا سيكولاريزمێ نينە، چونكى جهێ وێ نينە، پاش مە گوهـ ل خەلكێ سيكولاريست بوويە، كو گوتيە: دڤێت سەرێ ئيسلامييان بهێتە هەڕشاندن و كوتان، بەلێ ئيسلامييان نە دەستهەڵات هەبوويە، نە تشتەكێ هوسا گوتيە، مەرەما من ل هەرێما كوردستانێ يە، ژبو وێ چەندێ كو نەزڤرين ژبو ديروكا ئەمەوى و عەبباسيان.

٢- ڕەدكرنا هزرى و دەرئێخستنا بێ بەهانەيى: كو ئەڤە مەرەما مەيە ژ وێ ئاخفتنێ كو: دناڤ مللەتەكێ موسڵمان كو ژ ئيسلامێ تێگەهشتبيت، چ بەهانەيەك ژبو وان نينە كو بەرێ خو بدەنە سيكولاريزمێ، چونكى:

**ئێكەم:** هەر چ تە دڤێت ژ وان تشتێن، كو خەلكێ ئەوروپا ژبو بدەستڤەئينانا وان، بەرێ خو دا سيكولاريزمێ، د ئيسلاما تە دا يێن هەين ب شێوەيەكێ باشتر.

**دووهەم:** و هەمى ئەو ئەگەرێن، كو خەلكێ ئەوروپا نەچاركرى، بەرێ خو بدەنە سيكولاريزمێ، و ل بن چەنگێ كەنيسێ برەڤن، د ئيسلامێ دا هەبوون ژبو نينە، دينێ تە (ئيسلام):

---

(١) ئەو پرسيار يا دكتور عادل باخەوانى بوو.

١- كەنیسە تێدا نینە.
٢- چینا ئەكلیروس[(١)] تێدا نینە.
٣- ثیوكراسیی تێدا نینە.
٤- رێك ژ زانینێ نەگرتی یە.
٥- رێك ژ هزركرنا عەقلی نەگرتی یە.
٦- رێك ژ ئازادیێ نەگرتی یە.
٧- هەمی تشتەكێ باشێ دونیا و قیامەتێ تێدایە، لەوما تو نە یێ نەچاری بەرێ خو بدەیە سیكولاریزمێ.

ئانكو: مەرەم ژ قەبویل نەكرنێ، ئەڤەیە، كو ئەم دبێژین: ژبو خەلكەكێ موسلمان، ئەگەر ژ ئیسلامێ تێگەهشتبیت، و باوەری ب ئیسلامێ هەبیت، بەرێ خو نادەتە غەیری ئیسلامێ، نەكو ئەم رێكێ نادەین، خودایێ دلوڤان كەرەم دكەت و دبێژیت:

﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ آل عمران.

ئەڤە ژبو روژا دوماهیێ یە، هەر كەسەك خو ب موسلمان بزانیت، لدویڤ بەرنامەیەكێ دی ژبلی ئیسلامێ بكەڤیت، ل روژا دوماهیێ ژێ ناهێتە قەبیل كرن، پا د دونیایێ دا؟ ژبو دونیایێ ژی خودایێ دادگەر كەرەم دكەت و دبێژیت:

﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾ الكافرون.

---

(١) چینا ئەكلیروس، یەعنی، چینا زەلامێن ئایینی (رجال الدین)، چونكی ل دویڤ رێنمانییێن كەنیسێ، ژبلی زەلامێن ئایینی: پاپا و قەشەیان، چ كەسەكی ئەو مافە نەبوو كو تەفسیرا پەرتووكا پیروز (الكتاب المقدس) بكەت، كو د ئیسلامێ دا تشتێ هوسا نینە.

چونكى علمانييەتىٚ ئەز ب دين دزانم، چ بەرەيىٚ، ئيلحاديیا وىٚ، چ بەرەيىٚ دى يىٚ وىٚ، ئەڤىٚ خودىٚ نياس بيت، و تەنانەت باوەرى ب بەشەكىٚ ئيسلامىٚ ژى هەبيت، ب هەردوو جورێن وىٚ ڤە، ئەز ب دين دزانم، علمانيەت ژى دينەكىٚ مروڤيە، مروڤى يىٚ دروست كرى، بەلىٚ خودايىٚ زانا و خودان شيان دبێژيتە من: ﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾ الكافرون.

ئانكو: ئاينىٚ هەوە ژبو هەوە، و ئاينىٚ من ژبو من.

و دبێژيت: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ۝٢٩ ﴾ الكهف.

ئانكو: و بێژە: حەق يىٚ ژ لايىٚ خودايىٚ هەوەڤە، ئەڤجا كىٚ دڤێت بلا باوەريىٚ بينيت، و كىٚ ژى دڤێت بلا بىٚ باوەر بيت.

ئەڤجا ئەڤا من دڤێت بزانين، ئەڤەيە كو علمانييەت ژى جورەكە ژ دينى، تو خو ب موسلمان بزانى، نەشێى علمانى بى[1]، بێژە: موسلمان نينم و خلاس، ئيدى ئاشكەرايە، كو د ئەڤى وەلاتىٚ مە دا، نوكە ژى چەندەهان كەمينەيێن نە موسلمان هەنە، و د ديروكا سێزدە سەدەيێن دەولەتا ئيسلامى ژى، بووزايى هەبوينە، جوهى هەبوينە، مەسيحى هەبوينە، هندوس هەبوينە، مەجووسى هەبوينە، هەتا زانايێن ئيسلامىٚ و سەركردەيێن ئيسلامىٚ گوتيە: نابيت ئاگرىٚ مەجوسيان بهێتە ڤەمراندن! پرسيار ژ عومەرىٚ كورىٚ خەتابى (خودىٚ ژىٚ ڕازى بيت) هاتە كرن، گوتىٚ: ئەو نيكاحا مەحارما دكەن، واتە: دەيك و كچ و خويشكێن خو مارە دكەن، گوتىٚ: (دعهم وما يدينون) ژ وان

---

(١) ئانكو: ب ڕامان و تێگەهىٚ ڕاستەقينە يىٚ علمانييىٚ (سيكولاريست)، نەكو جورە ڕامان و تێگەهەك كو ئەم ژبو دروست دكەين، يان ب لاسايكرنا ڕوژئاڤا وەردگرين، كو بێگومان ئەم و ئەو وەك ديروك، وەك ئايين، وەك پەرتووك .. گەلەك ژ ئێك جودانە، وەكى ژبەرى نوكە مە بەحس ژىٚ كرى.

ڤەبن و بهێلن، مادەم دینێ وان وەسایە، موعتەقەداتێن وان وەسانە، هەوە چ حەق لسەر نەبیت.

ئانكو: وەك هەبوونا بەهانە و هێجەتا هەوار ژبو برنێ و دویڤكەفتنێ، ئەم چ جورەكێ علمانییەتێ قەبویل ناكەین، بەلێ وەك رێك پێدان و سەرەدەریا رۆژانە، ما ئەڤە نینە مە هەڤدوو قەبیل كری! ب راستی مە گازندە یا ژ سیكولاریستان هەی، كو غەیری خو ئەگەر ب تیوریی (نظري) ژی قەبویل بكەن، ب كریار وان قەبویل ناكەن، ب چ بەلگەهەك؟ ب بەلگەهێ وێ چەندێ، كو خو ب خودانێ هەمی تشتەكی دزانن، و خەلكێ دی یێ خو ژێ مەحروم دكەن، و ئەم وەك ئیسلامی، خو ب بەهر خواری دزانین، نەكو هەر د ئەڤێ هەرێمێ دا، ل گەلەك جهێن دی ژی، ئەڤە ئەمین دبێژین: وەرن دا هەڤدوو قەبویل بكەین، دبێژین: هەروەكی چەوا مە هوین قەبویلن، خو مالێ ژ مالێ خویی نە یێ حەرامە، وەلاتەكێ موسلمان تێدا ئاكنجی، تو یێ هاتی و تە دینەكێ دی یێ ئینایە د هەبوونێ دا و ژبو وان ئینایی، ئەڤجا ئەز تە قەبویل دكەم، ب دینێ هەوە ژی ڤە، چونكی دینێ من وەسا فەرمانێ ل من دكەت، هوین ژی مە قەبویل بكەن، بەلێ مە قەبویل بكەن، وەك مروڤ، وەك هاولاتیێ یەكسان، نەكو وەك هاولاتیێ پلە سێ و چوار، و نەكو ژ مافێن رەواییێن من ب خێر تشتەكی بدەیە من، د بەرامبەر وێ چەندێ دا، كو تە چ ڤیا ئەز وێ بكەم!!

**هەڤدەهەم: ب نسبەتی ئەوا پروفیسور میشێل، گوتی:** ئەز دێ بێژمێ: تشتەكێ سەیرە، دیموكراسی كو د دیروكا هەڤچەرخا مە دا ژبو ئێكەمین جار ل ئەوروپا، ل فرەنسا هاتە خوارێ و پراكتیزە بوو، پشتی شورەشا فرەنسی (١٧٨٩)، بو من یا سەیرە پشتی دوو سێ سەدەیان، نوكە ژی ل فرەنسا، دناڤ دیموكراسیا وێ دا و دناڤ علمانییەتا وێ دا، جهێ دوو سێ ئافرەتێن ب

دەرسوك لێ نەبیت، ئەڤە کێماسییەکا مەزنە ژبو فرەنسا، حەیفە جهێ دوو سێ ئافرەتێن ب دەرسوك نەبیت، کو دەرسوکا وان دەربڕینێ ژ هزر و موعتەقەداتێن وان دکەت، پا هوین نابێژن ئازادیا ڕادەربڕینێ، نابێژن: ئازادیا تاکە کەسی، بوچی دبیت جهێ وێ ئافرەتێ نەبیت؟ ب دیتنا من دڤێت گەلەك ب جددی پێداچوونێ د ئەڤێ چەندێدا بکەنەڤە.

## پێنج خولەکێن دوماهیێ

**هەژدەهەم: د ئەڤان پێنج خولەکاندا ب پێدڤی دزانم بەحس ژ وێ چەندێ بکەم، کا بوچی ل دور دیروکا سیکولاریزم و دیموکراسیێ ئەز زڤڕیم ژبو دیروکا ئەوروپا؟! کو کاك مەلا بەختیاری چەند جارەکا ئاماژە پێ کر، کا من بوچی ئەڤ چەندە بەحس کر؟**

**بەرسڤ:** ئەم یێ بەحسێ سیکولاریزم و دیموکراسیێ دکەین، دیموکراسی و سیکولاریزم ژی یێن ژ ئەوروپا هاتین، لەوما: نەچارم بەحسێ دیروکا وێرێ بکەم، کو ئەو سیکولاریزم چەوا پەیدا بوویە؟ و ئەو دیموکراسی چەوا هاتە جێبەجێکرن، و هەرێما کوردستانێ بەراورد بکەین، کو مە د ڤێرێ دا چ کریە و چەوا کریە؟

و من دڤێت وێ چەندێ ڕون بکەم، کا بوچی ئایینێ مەسیحی کو هاتیە تێکدان و شێلیکرن لسەر دەستێ کەنیسێ "نەکو ئەوا خودێ ژبو عیسای فرێکری (علیه السلام)" نەشێت ژیانا بەشەری د ئەڤێ ڕوژەڤێ دا ڕێك بێخیت، جارێ مەسیح، عیسا (علیه السلام) ژبو قویناغەکا دیروکی و بتنێ ژبو ئیجاخەکێ هاتبوو، کو بەنی ئیسرائیلی بوون، هەروەکی خودێ کەرەم دکەت و دبێژیت:

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ...﴿٦﴾ ﴾ الصف.

ئانكو: عيسا بتنێ يێ ژبو بەنى ئيسرائيليان هاتى، ئانكو: تشتەكێ ئاسايى و چاڤەرێكرى يە كو: ئايينێ عيسايى نەشێت د سەدەيێ بيستێ و بيست و ئێكێ دا، و ژبەرى هينگى ژى ژين و ژيارا كومەلگەهێ رێك بێخيت، مەسيحييەتەكێ شەريعەتەك نەبيت، برێڤە ببەت، خەلكێ نەچارە هەوارا خو ژبو تشتەكێ دى ببەت، ب تايبەت پشتى وێ چەندێ، كو ئيسلام هاتى، دەمێ خودايێ بلند و مەزن، ئيسلام فرێكرى، ژبو وێ چەندێ فرێكر، كو هەمى بەشەرييەت ب وێ برێڤە بچيت، هەروەكى د ماوەيێ سێزدە سەدەيێن دەولەتا ئيسلامى، بەشەرييەت يا پێ برێڤە چويى، دگەل وێ چەندێ كو كێم و كاسى و لادان ژى هەبووينە، ئەڤجا ئەڤا كو ئاريشە د ڤێرێ دا ئەڤەيە: دەمێ د ئيسلامێ دا دين و دەولەت ژێك دهێنە جوداكرن، ب ئەڤێ چەندێ تو ستەمێ ل ئيسلامێ دكەى، چونكى ئيسلامێ شەريعەتێ هەى، بەلێ د ئايينێ مەسيحى دا هەر چوار ئنجيلێن وێ بخوينە، هەمى شيرەتێن روحى و بەحسێ پەيوەنديێ يە دناڤبەرا خودێ و مروڤى دا، بەلێ بەحسێ حەلالى و حەرامى و شەرى و ئاشتيێ و حوكمى و سياسەتێ، و ئابووريێ، و بەحسێ پەيوەنديێن دناڤبەرا دەولەتان دا و ... هتد، تێدا نينە.

**نوزدەهـــەم: کـــاك مـــەلا بـــەختیاری ب تەعلیقڤـــە، ئامـــاژە ب ئایـــەتا:** ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ ...﴾ الأنفال، **کر، کو ئیسلامێ بەحسێ ئامادەکرنا هێزێ کریە و فەرمان یا ب شەڕی و جیهادێ کری!!**

**بەرسڤ:** هەر قەوارەیەکا سیاسی، وەکی: فرەنسا و ئەمریکا و ئەوێن دی کو ماڤێ ڤیتوییێ هەی، د جڤاتا ئەولەهییێ (مجلس الأمن) دا[1]، و هەمی ئەوێن چەکێ ئەتومی هەی، هێز و لەشکەر و چەك و کوگەهێن چەکی یێن هەین، کاك مەلا بەختیار! ئەرێ پا نابیت دەولەتان چەك هەبیت، دا بەرەڤانییێ پێ ژ خو بکەن؟ لەوما دەولەتا ئیسلامی، کو خودێ لسەر وێ فەرز دکەت، کو دڤێت هێز هەبیت، هەتاکو دوژمنێ خو پێ بترسینن، ژبو وێ چەندێ کەس ستەمێ لێ نەکەت، ئەڤە تشتەکێ گەلەك ئاساییە، کومەلگەها بەشەری هەر هوسایە، ئەگەر تە هێز نەبیت، ستەم دێ ل تە هێتە کرن و دێ هێیە خوارن! بو نموونە: گەلێ کورد ئەگەر هێز نەبیت، پێشمەرگەییێن مە، ئەگەر نوکە بەرەڤانییێ ژ ئەڤی کیانی نەکەن، داعش و ماعش دێ مە خون!



(١) ئەو دەولەتێن ماڤێ ڤیتو (veto)یێ هەی د جڤاتا ئەولەهییێ دا ، ئەڤ پێنجەنە: ئەمریکا، چین، رووسیا، بریتانیا، فرەنسا.
دیارە هەبوونا ئەڤی مافەی ژی بو ئەڤان پێنج دەولەتان ستەمەکا مەزن یا سیاسی یە بەرامبەر دەولەتێن دیتر یێن جیهانێ.

**بيستەم: كاك مەلا بەختيارى ب مەرەما ئينانا بەلگەهەكى لسەر دروستيا ژێك جوداكرنا ئايين و دەولەتێ، ئايەتەكا ئنجيلێ ئينا، بەلێ ئايەتا ئنجيلێ ژى ب خەلەتى ئينا، و بەلگەهێ وى ژى نە د جهێ خو دايە.**

ئايەتا ئنجيلێ ب ئـەڤى شـێوەيەيە: (أعطـوا مـا للقيصـر للقيصـر، ومـا لله لله)[1]، لەوما ژى ئاخفتنا وى ب بەلگەهـ ناچيت، چونكى مەسيحييەت هاتبوو، كێم و كاسيێن جوهييان ڕاست بكەت، و ژبو قويناغەكا ديروكى يا دياركرى، و ژبو ئيجاخەكا دياركرى هاتبوو، بەلێ ئيسـلامەك ب پانيـا زەمـانى و درێـژاهيا ئەردى، ژبو هەمى مروڤايەتيێ هاتبيت، هەروەكى خودايێ تاك و پـاك كـەرەم دكەت و دبێژيت:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٢٨ ﴾ سبأ[2].

ئەڤێ ئيسلامێ هند تێدا هەيە، كو هەمى بەشەريەتێ ب هيدايەت بينيت، و ژيـانێ لســەر ئاسـتێ تـاكى و خێزانـى و جڤـاكى ڕێـك بێخيـت، لـەوما ئـەوێ ئيسلامێ تو ستەمێ لێ دكەى، دەمـێ لايـەنێ حـوكمڕانييێ ژێ جـودا دكـەى، چونكى دێ شەريعەتێ وێ ژ كار ئێخى، بەلێ مەسيحييەتێ بخـو شـەريعەتەك نينە، هەتاكو ژ كار بهێتە ئێخستن، لەوما ئەگەر ژ دەولەتێ ژى جـودا بكـەى، تشتەكێ ئاساييە.

---

(١) بەرێ خو بدە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، إنجيل لوقا، الإصحاح: ٢٠، ص٢١٤٣، دفع الجزية للقيصر، واتە: ئەوا قەيسەرى بدەنە قەيسەرى، يـا خـودێ ژى بدەنـە خودێ.

(٢) ئانكو: و مە تو ژبو هەمى خەلكى يێ فرێكرى، مزگينييێ بدەيـە وان و وان بترسـينى، بـەلێ پـتريا خەلكى نزانن.

**خواندەڤانێ هێژا!**

ب پێدڤی دزانم، ئەگەر گەلەك ب کێمی ژی بیت، بەرسڤا چەند ئاخفتنەکان بدەم "کو ژیەر کێمیا دەمی" د دییەیتێ دا، من دەلیڤەیا بەرسڤدانا وان و ئاخفتنێ لسەر وان نەبوو.

**سەرجەمێ وان ئاخفتنا ژی (١١) نە، حەفت ژ وان یێن کاك مەلا بەختیاری نە و چوارێن دی ژی یێن (میشێل ڤیڤیورکا) نە.**

**ئێکەم: چەند ئاخفتنەکێن کاك مەلا بەختیاری:**

**١- ئەڤا (صلاح الدین)ی کری بەرامبەری فاتیمییان:**

کاك مەلا بەختیاری د چوارچوڤێ ڕەخنەگرتنێ ژ دیروکا ئیسلامێ و موسلمانان، بەحسێ وێ چەندێ کر، کو دبێژن (صلاح الدین)ێ ئەیوبی ستەم یا ل فاتیمییان کری، کو دوماهی ب حوکمڕانیا وان ئینایە!

**بەرسڤ:**

ڕاستە (صلاح الدین)ی خودێ ژێ ڕازی بیت، دوماهی ب حوکمڕانیا (فاطمیة) ئینایە، بەلێ نەکو هەر کارەکێ خراپ نەکریە و ستەم لێ نەکریە، بەلکو ئەو کار ئێك بویە ژ کارێن هەرە باش یێن (صلاح الدین)ی، و دوماهی ئینان بویە، ب ستەمەکا (٢٠٨) سالی یا فاتیمییان، کو ب زور خو سەپاندن، ژ سالا: (٣٥٩)ێ مشەختی، هەتا (٥٦٧) حوکمێ (مصر)ێ و بەشەك ژ ناڤچەیێن دەردورێن وێ کریە[1].

---

(١) بەرێ خو بدە: (البداية والنهاية) لإبن كثير ج١٤، ص٢٠٨.

هەژى گوتنێ يە ئێكەمين حوكمڕانێ فاتيمييان، نازناڤێ (مهدي) هەبوويە و ناڤێ وى (عبيدالله بن ميمون القدَّاح) بوويە، كو جوهى بوويە، خو ب موسلمان نيشان دايە، و كارێ وى بوياغچى بوويە، ل (سلمية)[1].

و (إبن كثير)ى يێ نڤيسى و (إبن الأثير) بەحسێ وێ چەندێ كريە، كو (مهدي) نامەيەك يا فرێكرى ژبو (أبو ظاهر القرمطي) و لومەيا وى كريە لسەر وێ چەندێ، ئەوا ل مەككەهێ كرى "كو كەعبە يا هەرڤاندى و بەرێ ڕەش (حجر الأسود) يێ برى" و يێ گوتى: ئەو سەرەدەريا هەوە ئەگەرێ وێ چەندێ يە، كو خەلك ئاخفتنا لسەر مە بێژيت، و ئەو نهێنيێن مە، كو مە ڤەشارتين، ب ئەگەرێ وێ سەرەدەريا هەوە يا كرێت، ئاشكەرا ببن[2].

ئانكو: (قرامطة) و (فاطمية) د ڕەهـ و ڕيشالدا ئێك بوون و دان و نوكێن وان پێكڤە كەلينە.

ئەڤجا پشتى حوكمڕانيا (فاطيمة)، كو ب (العُبَيديين) ژى بەرنياسن، ناڤێ وى (عبدالله) و نازناڤێ وى (عاضد) بوويە و (إبن كثير) هوسا بەحس دكەت: (وكانت سيرته مذمومة، وكان شيعياً خبيثاً، لو أمكنه قَتَلَ كُلَّ مَنْ قَدَرَ عَلَيْهِ مِنْ أهْلِ السنة)[3]. ئانكو: و سەرەدەريا وى گەلەكا بێزاركەر بوويە، و شيعەكێ پيس بوويە، ئەگەر پێ چێببا، هەر چ بەردەستێ وى كەفتبا ژ ئەهلێ سوننەتێ، دا كوژيت.



(١) بەرێ خو بدە: (البداية والنهاية) لابن كثير ج١٢، ص٨٣.
(٢) هەمان ژێدەر ج١٢، ص٨٤، و (الكامل في التأريخ) لإبن الأثير ج٨، ص٢٠٨.
(٣) هەمان ژێدەر ج١٤، ص٢٠٨.

**٢- كوشتنا (قرامطة) ژلايێ دەولەتا ئیسلامیڤە:**

هەر د وى چوارچوڤەيدا، كو دبێژن موسڵمانان خوين يا ڕێتى و ستەم يا كرى، كاك مەلا بەختيارى بەحسێ وێ چەندێ كر، كو موسڵمانان (قرامطة) ژى بێن كوشتين!

**بەرسڤ:**

وەسا ديارە كاك مەلا بەختيارى پێزانين لدور گرۆپێ قەرامیتییان (قرامطة) نينە، چونكى دناڤ گرۆپێن لاداى دا، چ گرۆپەكى هندى (قرامطة) ستەم و خرابى و كارێن نە مەعقوول نەكرينە، زێدەبارى كوفر و زەندەقا ئاشكەرا، دا سەنجێ بدەين:

(إبن كثير) د ڕويدانێت سالا (٣١٧)ێ مشەختى دا، ل بن ناڤ و نيشانێ: (ذكر أخذ القرامطة الحجر الأسود إلى بلادهم، وما كان منهم إلى الحجيج، لعن الله القرامطة)[1] دا، گوتيە:

{كاروانێ عيراقێ، كو فەرماندەيێ وان (منصور الدَّيلمي) بوو، برێكەفتن و ب سەلامەتى گەهشتنە مەككەهێ، و ژ هەمى لايانڤە كاروانى گەهشتن، پاشى ژ نيشكەكێ ڤە (قرمطي) (ئانكو: أبو طاهر) د ڕوژا (تروية) دا (ئانكو: ڕوژا "٨"ێ "ذي الحجة") وى و كوما خو ب سەر وان دادا، مالێ و سامانێ وان ژێ ستاندن و كوشتنا وان حەلال كر، وخەلكێ دناڤ مەككەهێ و دول و نهالێن وێ دا، هەتا د مزگەفتا حەرام و دناڤ كەعبێ دا كوشتن ...

ئێدى خەلك ژ وان دڕەڤين، خو ب پەردەيێن كەعبێڤە هەلدواسين، بەلێ مفا نەبوو، بەلكو ب وى حالى ژى، هەر دكوشتن، و ل دەمێ تەواڤێ هەر ئەو دكوشتن ...

(١) ئانكو: برنا بەرێ ڕەش ژلايێ قەرمەتيیانڤە، ژبو وەلاتێ خو و ئەوا وان ب سەرێ حەجييان ئينايى، خودێ نەفرەتێ ژ قەرمەتيیان بكەت.

پاشى قيرميطى فەرمان كر: كو ئەو كەسێن هاتينە كوشتن بهاڤێنە هاڤێتن بو دناڤ بيرا زەمزەم دا، پاشى فەرمان كر، و دەرگەهێ كەعبێ هاتە كولێن، و پەردەيا وێ دراند، و لسەر هاولاتييان‌دا دابەش كر...

پاشى فەرمان كر: و بەرێ رەش كولا و دگەل خو بر ژبو وەلاتێ خو، ژبو ماوەيێ بيست و دوو (٢٢) سالان ل دەف وان ما، هەتاكو ل سالا (٣٣٩)، زڤراند (٣١٧ – ٣٣٩)[1]}

پاشى (إبن كثير) لدور (قرامطة)، دبێژيت: (وإنما حمل هؤلاء على هذا الصَّنيع، أنهم كانوا كفاراً زنادقة، وقد كانوا ممالئين للفاطميين الذين نبغوا في هذه السنة، ببلاد إفريقية، من أرض المغرب)[2]، ئانكو: و ئەڤان ژبو وێ چەندێ ئەڤە كر، چونكى كافر و زەنديق بوون، و سەر ب فاتيمييان بوون، كو دڤان سالان دا ل وەلاتێ ئەفريقيا لسەر ئاخا (مغرب) پەيدابوون.

هەروەسا (إبن كثير) ل دور رويدانێت سالا (٢٩٤)ێ مشەختى، گوتيە: {و د موحەررەما ئەڤ سالە دا "زكرويە" و هەڤالێن وى (خودێ نەفرەتا لێ بكەت) رێك ژ حەجيێن خوراسانێ گرت، ل دەمێ زڤرينا وان ل مەككەهێ، و هەمى كوشتن و ئافرەتێن وان ژى وەك كويلە گرتن، و ئەو پارەيێ ژێ ستاندى: دوو هزار هزار (٢,٠٠٠,٠٠٠) دينار بوون، و هەژمارا كوشتيان، بيست هزار (٢٠,٠٠٠) كەس بوون}[3].

هەلبەت كەتن و تاوان و خرابيێن قەرمەطييان گەلەك ژ ئەڤێ چەندێ زێدەترن، و ئەوا مە بەحس كرى، بتنێ وەكى چەند نموونەيەكان بوون.

---

(١) بەرێ خو بدە: (البداية والنهاية) لإبن كثير ج١٢، ص٨٢، ٨٣.

(٢) هەمان ژێدەر ص٨٣.

(٣) هەمان ژێدەر، ج١١، ص٣٨٧، هەروەسا بەرێ خو بدە: (الكامل في التأريخ) ج٦، ص٤٣٢ و ٤٣٣.

ئـەڤجا: ئـەرێ تشـەكێ سـەیر و نـە دجهـێ خـودا نینـە، كـو گازنـدە ژ موسـڵمانان بهێتـە كـرن، كـو ئـەو گروپـێ زەنـدیق و بـێ دیـن ب سـزایێ خـو گەهاندین؟!

**٣- ئیسلام ب شیری بەلاڤ بوویە، خو خـەلك ب كرنـا سـەمایێ، بـەرەف وێ نەچوون:**

ئەڤە ژی ئێكا دی بوو ژ ئاخفتنێت كاك مەلا بەختیاری، كو چـەند جارەكـا دوبارە كر، و گەلەك لسەر چوو.

**بەرسڤ:**

**ئێكـەم:** وەكـی مەبدەئو پرەنسیپ، نـە یـا گونجایـە ئیسـلام ب زوری لسـەر خەلكی بهێتە سەپاندن، چونكی خودایێ دادگەر ڕاگەهاندیە، كو زوری لێكـرن (إكراه) د ئاییـنی دا نینە، هەروەكی گوتیە:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقرة.

**دووهەم:** وەكی پڕاكتیـك و كریـار ژی، هـەردەم لەشـكەرێ موسـڵمانان، سـێ بژاردە بێن داینە بەرامبەرێن خو:[1]

١- موسڵمان بوون.

٢- دانا جزییێ، یان هـەر جـورەكێ دی ژ ڕێكـەفتنێ، كـو دەولـەتا ئیسـلامی قەناعەتێ بكەت، كو ئەو خەلك دژایەتیا وان ناكەن.

٣- بەرهەڤ بوون ژبو شەڕی.

(١) بەرێ خو بدە: تأريخ الأمم والملوك، للطبري ، ج٢ ، ص١٠٧ و ١٠٨ ، كـو (ربعـی بـن عـامر) وەك نوینەرێ لەشكەرێ ئیسلامێ گوتیە (رسـتم) فەرمانـدەیێ لەشـكەرێ فارسـان: (واخـتر واحدة من ثلاث: اختر الإسلام، وندعك وأرضك، أو الجزاء، أو المنابذة) ئانكو: ئێك ژ ڤان سێ تشتان هەلبژێرن: موسڵمان بوونێ هەلبژێرە تو و وەلاتێ خو، یان جزییێ بدە ، یان بەرهەڤ بە ژبو شەڕی.

**سێیەم:** ئەگەر ڕاست بیت ئیسلام ب زوری لسەر مللەتێ کورد "هەروەسا مللەتێن دیتر ژی" هاتیە سەپاندن، دڤیا ژمێژەبا مللەتێ کورد دەست ژ ئیسلامێ بەردابان، چونکی هەر تشتەك ب زوری بهێتە سەپاندن، پشتی چونا وێ دەستهەلاتێ، دێ هێتە هاڤێتن و دەست ژێ هێتە بەردان!

ئەڤجا:

گوتنا: ئیسلام ب زوری هاتیە سەپاندن، لسەر مللەتێ کورد، هەڤدژە دگەل ئەڤان:



أ- سروشتێ ئیسلامێ.

ب- دیروکا موسلمانان.

ج- عەقل و لوژیکێ، دا[1].

**٤- جیهانبینیا من جودایە، یا تە ب دیتنا ئیسلامێ یە، یا من ب دیتنا سیکولاریزمێ یە.**

**بەرسڤ:**

تێبینیا من لسەر ئاخفتنا کاك مەلا بەختیاری، ئەڤەیە، کو مادەم خو ب موسلمان دزانیت، پێدڤیە جیهانبینی و هەبوونناسی (ontology) یا خو ژی هەر ژ ئیسلامێ وەربگریت، نەکو ژ سیکولاریزمێ، چونکی هەبوونناسی و دونیابینی، بناغێ بیر و باوەر و هەمی سەرەدەری و هەلویستێن مروڤی نە، و هەر کەسێ ب ویی شێوەی هەبوونێ (وجود) ببینیت، کو ئیسلام دبێژیت، دیارە هەر ب وی شێوەی ژی سەرەدەریێ دگەل ژین و هەبوونێ دا دکەت، کو وێ دیتنێ ددەتە دیارکرن، هەروەسا بەروڤاژی ژی! لەوانێ تو خو ب

---

(١) وەسا باشە لدور ئەڤێ چەندێ سەرنجا ئەڤان پەرتووکان بهێتە دان:
١- کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیی دا ، نڤیسینا: حەسەن مەحمود حەمە کەریم.
٢- کورد لەنێوان بەئیسلام کردن و ئیسلام بون دا ، نڤیسینا: سەلام ناوخۆش.

موسلمان بزانى و هەوارا خو ببەيە لدەف جيهانبينيا سيكولاريزمىٚ، هەڤدژى (تضادّ)يەكا توند دناڤبەرا وان دا هەيە[1].

**٥- ئەم هەمى ژ مودێرنێتىٚ مفادارين، ئەڤە دەستكەفتێن عەقلينە، نەكو نڤشتى و غەيبيياتان:**

**بەرسڤ:**

مفاداربوونا هەمى لايەكى ژ تازەگەريىٚ (الحداثة) (Modernita) تشتەكە گەنگەشە و جرە لسەر ناهێتە كرن، بەلىٚ يا گرنگە بهێتە زانين، كو ئەڤ مودرێرنێتە، بەرهەمىٚ هەمى ئەزموون و شارەزايێن لسەر ئێك كوم بوويێن مروڤايەتيىٚ يە، و يا چ مللەت و كومەلگەهەكىٚ بتنىٚ نينە، هەروەكى ژبەرى نوكە ژى مە بەحس ژىٚ كر.

پاشى ئەو چەندا كو تازەگەريى و تەكنولوجيا بەرهەمىٚ عەقلى يە، نەكو يا نڤشتى و غەيبيياتان، ئەم ژى نكولێىٚ ژ ئەڤىٚ چەندىٚ ناكەين، كو بێى بكارئينانا عەقلى و ديتنا ياسايێن خودىٚ (سنن الله) د بونەوەر و سروشتى دا، بێگومان ژيانا بەشەرى بەرەف پێش ناچيت، بەلىٚ من نەزانى: ناڤبرى ب وىٚ ئاخفتنىٚ بەرسڤا كىٚ ددەت؟!

چونكى ئەو ئيسلام بوو، عەقل و هزرێن مروڤان ژ زنجير و زيندانا ئەفسانەيى و كەهانىٚ دەربازكر، و لسەر عەقلىٚ وى فەرز كر، كو دڤێت هزر بكەت، و سەرنجىٚ بدەتە ديارده و ديمەنێن دەوروبەر و بونەوەران و ژ ئايەتێن خودىٚ بفوكريت:

- ﴿ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ١٧٦ ﴾ الأعراف.

---

(١) د پەرتوكا (تەوژميى ئيسلاميى و عەلمانيى...)دا من تيروژكەك دايە لسەر هەبوونناسيا ئيسلامى، بەلىٚ ڤەكولينا تێر و درێژى يا وى بابەتى، پەرتووكا ئێكىٚ يا مەوسووعەيا: (الإسلام كما يتجلّي في كتاب الله) ژبو هاتيە تەرخان كرن.

ئانكو: سەرهاتييان ڤەگێڕە، بەلكو هزر بكەن.

- ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ ﴿١٨٥﴾ ﴾ الأعراف.

ئانكو: ئەرێ سەرنجا ملكێ بەرفرەهێ ئەسمانان و ئەردى و هەر تشتەكى نەدايە، كو خودێ چێكريە.

- ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ﴾ البقرة.

ئانكو: ئەها ب ئەڤى جورەى خودێ ئايەتان ژبو هەوە ڕوون دكەت، بەلكو فام بكەن.

مەسەلەيا نەديار "غيب" ژى لسەر وێ چەندێ، كو بناغێ ئيمان و عەقيدەيا ئيسلامى باوەرى ئينانە ب تشتەكێ نەديار:

﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ ﴾ البقرة.

نوكە ژى پشتى بەرەف پێش چوون و كوير چوون د زانستێن فيزيا و كيميا و گەريلەناسى، ژبو هەمى لايەكى دەركەفتيە، كو دوماهى و بنەجهيا پێزانين و زانستێ هێشتا يا د جهێن نەديار و ڤەشارتى دا مايى.

### ٦- بوچى ديموكراسى نەهاتە چەسپاندن د ئيسلامێ دا ؟!

**بەرسڤ:**

بێگومان، ئيسلام ب ئەگەرێ حوكمڕانيا ڕەشيد و سەر ڕاستيا پێغەمبەرێ خاتەم، و چوار جهـ نشينێن وى يێن سەر ڕاست، (خودێ ژێ ڕازى بيت)، كو فەرمانا خودێ: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾ الشوري، يا كريە بناغەيێ كارێ سياسى و دەولەتداريێ، بەرێ بناغەيێ: (خەلك ژێدەرێ دەستهەلات بوون)ێ دانا، بەلێ ب لێبورينڤە كومەلگەهێن وى سەردەمى، نەشيان بچنە وى ئاستێ

بلند، و ئەو جورێ حوکمڕانییێ، بتنێ دەورێ چل (٤٠) سالان دەوام کر، د بیاڤێ شێوازێ دانانا کەسێ حوکمڕاندا.

ئانکو: سیچێت ئیسلامێ نەبوو، کو شێوازێ حوکم و دەستهەلاتێ یا کو د دەستێ خەلك و جەماوەری دا، بەردەوام نەبوو، بەلکو ئەڤە پاشکەفتنا مروڤی بوو، کو نەشیا بچیتە وی ئاستێ بلند و لسەر بەردەوام بیت.

ئەڤجا هەلبەت خەلکێ ڕوژئاڤا ژی، چەندین سەدەیان و سەدان سالان، تالیا: (ثیوکراسی Theocracy) و (ئەریستوکراسی Aristocrasy) و (ئوتوکراسی Otocracy) تام کریە، هەتاکو د ئەنجام دا گەهشتنە وێ قەناعەتێ ، کو شێوازێ حوکمڕانیا دیموکراسیێ تەبەنی بکەن.

**٧- تو بزڤڕی ژبو دیروکێ، ئەژی دێ زڤڕم ژبو دیروکێ!**

**بەرسڤ:**

زڤڕینا من ژبو دیروکا ڕوژئاڤا و ئەوروپا ب تایبەت، گرێدای بوو ب ناڤەڕوك و جەوهەرێ بابەتێ مە: (سیکولاریزم و دیموکراسی)، کو ل ڕوژئاڤا سەرهلدا، لەوما پێدڤی بوو، سەرنجا دیروکا سەرهلدان و ئەگەرێن هەوار ژبو برنێ بدەین د دیروکا ئەوروپا و ڕوژئاڤا دا، بەلێ تو نابێژیە من: زڤڕین ژبو دیروکا ئەمەوی و عەبباسی و فاتیمی و .. هتد، چ پەیوەندی ب بابەتێ مە ڤە هەبوو؟!

**دووهەم: چەند ئاخفتنەکێن میشێل ڤیڤیورکا:**

بەرێز پروفیسور ڤیڤیورکا ژی چەند ئاخفتنەك کرن، ب پێدڤی دزانم تیروژکەکێ بدەمە لسەر هەر ئێك ژ وان:

**١- هوین چەوا پروسەیا خواندنێ بەرەف پێش دبەن؟!**

**بەرسڤ:**

ب دیتنا من پروسەیا خواندنێ ل هەرێما کوردستانێ، ب چەند تشتەکان دێ بەرەف پێش چیت:

**ئێك:** هەر ژ باخچێ زاروکان، هەتاکو زانکو و خواندنا بلند ژی دەستێوەردانا حزبێ ژێ بهێتە دویرکرن، بەلا خو ژێ ڤەکەن، بلا پیشەییانە کارێ خو بکەن.

**دوو:** مفا ژ ئەزموونا وەلاتێن پێشکەفتی بهێتە وەرگرتن، بەلێ نەکو بتنێ ب درویشم و خو دەرئێخستن، بەلکو ب کریار و جێبەجێکرن.

**سێ:** زڤرین ژبو رەسەنایەتیا خو، د هەمی بیاڤاندا: جیهانبینی، عەقیدەیی، و هزری، و رەوشت و ئاکار، و دەستان ژ لاسایکرنا ئەڤی و ئەوی بەر بدەین.

**چوار:** بەرهەڤکرنا سەقایەکی، کو قوتابی و خواندەڤان، تێدا بتنێ مژویلی بدەستڤەئینانا زانست و شارەزاییا پتر و خو پێگەهاندنێ بن، ب تشتێن لاوەکی نەهێنە مژویل کرن.

**پێنج:** د بەرنامەیێ خواندنێ دا، ب تایبەتی د قویناغێن باخچێ زاروك و سەرەتایی و ناڤنجی و ئامادەییێ دا، زێدەباری فێرکرنێ (تعلیم) گرنگییەکا هەژی ب پەروەردەکرنێ (تربیة) ژی بهێتە دان، بەلێ پەروەردەیەکا گشتگیر و هەڤسەنگ، کو چ لایەکێ کەسایەتیا مروڤی نەهێتە پشت گوهـ هاڤێتن.

**٢- سیكولاریزم و دیموكراسی، دوو تشتێن پێكڤە گرێداینە و بێی هەڤدوو نابن.**

مەرەما وی ئەڤە بوو، كو هەر كەسێ بڤێت دیموكراسیێ جێبەجێ بكەت پێدڤیە ژبەری هینگی ببیتە سیكولار!

ئەڤ ئاخفتنە د وێ چاڤپێكەفتنێ دا كر، كو كەنالێ ڕووداو پشتی دیبەیتێ، دگەلدا ئەنجام دا.

**بەرسڤ:**

ئەز دشێم گەلەك بەلگەهان بینم لسەر هەلوەشاندنا ئەوێ ئاخفتنا بەرێز ڤیڤیوركا و ئیسباتكرنا بەروڤاژیا وێ، ئانكو: هەبونا سیكولاریزمێ بێی دیموكراسی، و هەبوونا دیموكراسیێ بێی سیكولاریزم:

**ئێك:** هەر ئێك ژ هیتلەرێ ئەلمانی، و موسولینێ ئیتالی، و ستالینێ ئێكەتیا سوڤییەت و (جمال عبدالناصر)ێ مسری و .. هتد، سیكولارێن دژوار بوون، و دیكتاتورێن مەزن بوون.

ئەڤجا: كانێ پێكڤەبوونا سیكولاریزم و دیموكراسیێ؟!

**دوو:** حوكمڕانیا ئیسلامی یا ڕەسەن، كو لسەر بناغەیێ مشێورەتێ (شوری) دهێتە ئاڤاكرن و هەمی بنەمایێن:

١- هەلبژاردن، و

٢- خەلك ژێدەرێ دەستهەلات بوونێ، و

٣- ڕادەستكرنا دەستهەلاتێ ب ئاشتیانە، و

٤- ژێك جوداكرنا دەستهەلاتێ، و

٥- سەروەریا یاساییێ، و

٦- دابینكرنا ماف و ئازادیان ژبو هەمی لایەكی بێ جیاوازی، و

٧- چەسپاندنا دادگەریێ، تێدا دەستەبەر دبن، و ئەو شێوازێ حوکمڕانیێ د سەردەمێ پێغەمبەرێ خودێ (صلی الله علیه وسلم) و چوار خەلیفەیێن وی: (أبوبکر ، عمر ، عیمان ، علی) دا (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گەلەك باش هاتە جێبەجێکرن، بەلگەهەکێ بهێز و نکولی لێ ناهێتە کرن، لسەر وێ چەندێ کو تشتەکێ گونجایە هەمی میکانیزم و بنەماییێن دیموکراسیێ، ل بن سیبەرا حوکمڕانیەکا ئیسلامی بهێتە چەسپاندن، ژبلی مەسەلەیا حەڕامی و حەلالی کو بکەڤیتە د دەستێ خەلکیدا، کو د ڕاستی دا ئەڤە ژی نەخوشی و خالا لاوازی (نقطة الضعف) یا دیموکراسیێ یە، و هەروەکی ژبەری نوکە ژی مە بەحس ژێ کر: ل بن سێبەرا پێگیریێ ب شەریعەتیڤە، "شەریعەتێ ئیسلامی" ئەو نەخوشی و خالا لاواز ژی چارەسەر دبیت، چونکی شەریعەت دبیتە پەرژانەك، و دیموکراسیێ ژ لادان (إنحراف)ێ دپارێزیت!

**٣- دیموکراسیێ ژی ئاریشە هەنە: ئابوریی، جڤاکی، ئەخلاقی .. هتد.**

**بەرسڤ:**

ئەژی پشتەڤانیا ئاخفتنا ڤیڤیورکای دکەم، کو بێگومان هەر ئەزموونەکا بەشەری د هەر بیاڤەکێدا، ژ کێم و کاسی و خەلەتی و عەیبان یا خالی نابیت، هەروەسا هەر ل ڤێرێ دبێژم:

ئێك ژ سیفەتێن باش لدەف ڕوژئاڤاییان ب گشتی، ئەڤەیە کو ب تەمامی تەسلیمی چ بیروکە و ئەزموونەکێ نابن، و هەردەم ب روحەکا ڕەخنە لێگرتن و دیتنا عەیب و خەلەتییان تێدا، سەرەدەریێ دگەل دکەن.

ئەڤجا ئەڤ هەلویستێ ڤیڤیورکا ل کیڤە، و هەلویستێ کاك مەلا بەختیاری و هەڤالێن وی یێن سیکولار ل کیڤە، کو پێگوتن و پەسنکرنا تامیا

ديموكراسيى و سيكولاريزمىٚ، ويردىٚ لسەر ئەزمانىٚ وايە، و ب چ شێوەيەكى وى مافى نادەنە خو، كو كێم و كاسى و خەلەتى و پنييان تێدا ببينن! !

**٤- ئەژى پشتەڤانيا وىٚ ئاخفتنا تە دكەم كو دبێژى ديموكراسى ژبەرى يونانيان "وەك ناڤەرِوك" هەر هەبوويە.**

**بەرسڤ:**

سالوخەتەكا ديتر يا پەسەند لدەف گەلەك ژ رِوژئاڤاييان ب گشتى، ئەڤەيە كو دەمىٚ حەقى دكەڤيتە لبەر سينگىٚ وان، ژلايىٚ بەرامبەرێن وان ڤە، دانپێدانىٚ پىٚ دكەن و ژبو دسەلمينن.

كو بێگومان ئەڤە سيفەتەكىٚ بلند و جوانە، ژ لايىٚ هەر كەسەكى ڤە بيت، هەروەكى بەروڤاژيا وىٚ ژى: نەسەلماندنا حەقيىٚ و دانپێنەدانان، ژ لايىٚ هەر كەسەكى ڤە بيت، سيفەتەكىٚ كرێت و خرابە.

هەلبەت ئيسلام ژى يا دگەل هەمى خێر و چاكى و پەسەندييەكىٚ، ژ هەر لايەكى ڤە بيت، و دژى هەر خرابى و نەپەسەندييەكىٚ يە، ژ لايىٚ هەر كەسەكى ڤە بيت، لەوانىٚ ژى زانايان وەك بنچينەيەكى گوتيە: (أُنظُرْ إِلى مَا قِيْل، وَلاَ تَنْظُرُ إِلى مَنْ قَال)، ئانكو: بەرىٚ خو بدىٚ و سەرنجىٚ بدە كا چ هاتيە گوتن، بەرىٚ خو نەدەيىٚ كا كىٚ گوتيە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنَّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٢٤/ شَعْبَان/ ١٤٣٧ م

٣١/ مايس/ ٢٠١٦ ز

هەولێر

ئەڤ لیستە، پێکهاتیە ژ هەمی بەرهەمێن هزری یێن ماموستا (عەلی باپیر)ی، ب پەرتووک و نامیلکەیان و ب زمانێ کوردی و عەرەبی.

| ژ | پەرتووک | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | أ / پەرتووکێن کوردی (ناڤ و نیشانێن وان هاتینە وەرگێڕان ژبو زاراڤێ بادینی) | | |
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١. | پوختەیەك لدور ئیسلامێ لبن ڕوناهیا سورەتا فاتیحە | چاپا ئێکێ/١٩٨٤<br>چاپا دوویێ/٢٠٠٦ | |
| ٢. | دا د خزمەتا قورئانێدا بین، {کومکرنا هەردوو پەرتووکێن: (چەوا باشتر ژ قورئانێ مفادار بین؟) و (ئەرکێ لسەر ملێن مە بەرامبەری قورئانێ)یە} | چاپا ئێکێ/٢٠٠٨<br>چاپا دوویێ/٢٠١٥ | |
| ٣. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ ئێکێ: سوورەتێن: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپا ئێکێ/٢٠١٢ | |
| ٤. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ دوویێ: سوورەتا: (آل عمران) | چاپا ئێکێ/٢٠١٢ | |
| ٥. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ سێیێ: سوورەتا: (النساء) | چاپا ئێکێ/٢٠١٣ | |

| ژ | پەرتووک | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٦. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ چوارێ: سوورەتا: (المائدة) | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٤ | |
| ٧. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ پێنجێ: سوورەتا: (الأنعام) | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٥ | |
| ٨. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ شەشێ: سوورەتا: (الأعراف) | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٦ | |
| ٩. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ حەفتێ: سوورەتا: (الأنفال) | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٦ | |
| ١٠. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ هەشتێ: سوورەتا: (التوبة) | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٧ | |
| ١١. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ نەهێ: سوورەتا: (یونس) | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٨ | |
| ١٢. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ دەهێ: سوورەتا: (هود) | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٨ | |
| ١٣. | تەفسیرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ یازدێ: سوورەتا: (یوسف) | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٩ | |
| ١٤. | دویکەفتنا سوننەتا پێغەمبەری ﷺ دناڤبەرا خەمساریێ و زێدەگاڤیێدا | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٥ | |
| ١٥. | رێبازا پێغەمبەرێ خودێ: پێناسە و گرنگی و پێدڤی | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٨ | |
| | **باوەری و هزرا ئیسلامی** | | |
| ١٦. | دبەرئێك راچوونا ئیسلامێ و کورەرێکان | چاپا ئێکێ/ ١٩٨٥<br>چاپا سێیێ/ ٢٠٠٦ | |
| ١٧. | پرۆژەیێ بەرنامەیێ هزری یێ کاری ئیسلامی | چاپا ئێکێ/ ١٩٩٦ | |

| ژ | پەرتووک | بەروار و چــاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| .١٨ | بنەمایێن شەرعی و هێلێن گشتیین کومەلا ئیسلامی | چاپا ئێکێ/٢٠٠١<br>چاپا سێیێ/٢٠١٤ | هاتیە وەرگێڕان ژبو زمانێ عەرەبی |
| .١٩ | چەند مەسەلەیەکێن بەربەلاڤێن سەردەمی، سەرنجدانەکا واقعیانە و هەلسەنگاندنەکا شەرعییانە | چاپا ئێکێ/٢٠٠٢<br>چاپا شەشێ/٢٠١٦ | هاتیە وەرگێڕان ژبو زمانێ عەرەبی و تورکی و فارسی |
| .٢٠ | نیاسینا خودێ، ئایین، ئیمان (ڕاستیێن ئیسلامێ گەش دبن و ئەفسانەیێن کورەڕێکان پویچ دبن) | چاپا ئێکێ/٢٠٠٢<br>چاپا دوویێ/٢٠٠٩ | |
| .٢١ | ناڤێن جوانێن خودێ "سبحانه وتعالى" | چاپا ئێکێ/٢٠١٣ | |
| | **مەوسووعەیا : ئیمان و عەقیدەیا ئیسلامی لبن ڕوناهیا قورئان و سوننەتێ**، (٦ بەرگ) | چاپا ئێکێ/٢٠٠٦-٢٠٠٨<br>چاپا دوویێ/ ٢٠١٦ | |
| .٢٢ | بەرگێ ئێکێ: ئیمان و عەقیدەیا ئیسلامی چییە و چەوایە؟ | | |
| .٢٣ | بەرگێ دوویێ: ئێکتاپەرستی ژبو خودێ د دروستکاریێ و خودایینیێ دا | | |
| .٢٤ | بەرگێ سیێ: ئێکتاپەرستی ژبو خودێ د ناڤ و سالوخەت و پەرستنێدا | | |
| .٢٥ | بەرگێ چوارێ: ئیمان ب: فریشتەیێن خودێ، پەرتووکێن خودێ، پێغەمبەرێن خودێ | | |
| .٢٦ | بەرگێ پێنجێ: ئیمان ب: ڕوژا دوماهیێ و قەزا و قەدەرێ | | |
| .٢٧ | بەرگێ شەشێ: تایبەتمەندیی و بوچوونێن دویکەفتیێن ڕێبازا ڕاست | | |
| .٢٨ | ڕێبـازا پێغەمبەری {صلى الله عليه وسلم} کیشکە؟! | چاپا ئێکێ/١٩٨٩ | پاشی هاتە دانان دناڤ پەرتووکا (موسلمانێ کامل: بەشێ ئێکێ: بیروباوەرێن موسلمانی) |

| ژ | پەرتووك | بەروارو چــاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| ٢٩. | موسڵمانێ کامل: بەشێ ئێکێ: بیـروباوەرێن موسڵمانی | چاپا ئێکێ/١٩٩٧ | پاشی هاتە دانان دناڤ پەرتووکا (ئیمان و عەقیدەیا ئیسـلامی لـبن روناهیا قورئان و سـوننەتێ) |
| ٣٠. | تەوژما ئیسلامی و علمانی و خالین وەکهەڤ و جیاواز | چاپا ئێکێ/٢٠٠٨<br>چاپا سێیێ/٢٠١٥ | پتریا وێ ب (٢٤) خەلـەکەیان ل هەفتەنـامەیا (هـاوولاتیی) و، ئەوا دیتر ژی ب (٩) خەلـەکەیان ل هەفتەنامەیا (ئاوێنە)دا هاتیە بەلاڤ کرن |
| ٣١. | ڕوونکردنا بنەماییێن شەرعی و هێلین گشتییێن کومەلا ئیسلامی | چاپا ئێکێ/٢٠١٢<br>چاپا سێیێ/٢٠١٤ | |
| ٣٢. | وەرگێڕانا کوردی یا عەقیدەیا طەحـاویی | چاپا دوویێ/٢٠١٧ | |
| ٣٣. | ڕوونکردنا عەقیدەیا طەحـاویی | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٥ | |
| ٣٤. | سیکولاریزم و دیموکراسی د ئەزموونا کوردستانێدا (دیبەیتا ساڵێ) | چاپا ئێکێ/٢٠١٦ | |
| | **مەوسووعەیا: هزرکرنا ئیسلامی دناڤبەرا وەحی و واقعیدا** | | |
| ٣٥. | پەرتووکا ئێکێ: پێناسە و چییە و سەرهاتی و ژێدەر و گرنگیا: هزرکرنا ئیسلامی | چاپا ئێکێ/٢٠١٨ | - |

| ژ | پەرتووک | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| .٣٦ | پەرتووکا دوویێ: هێلێن گشتیین رێبازا جەماوەریا موسلمانان | چاپا ئێکێ/٢٠١٨ | - |
| .٣٧ | پەرتووکا سێیێ: تەوژمێن سەرەکیین دیروکا موسلمانان | چاپا ئێکێ/٢٠١٨ | |
| .٣٨ | پەرتووکا چوارێ: ستوینێن هزرکرنا ئیسلامی | چاپا ئێکێ/٢٠١٩ | |
| .٣٩ | پەرتووکا پێنجێ: چەند بابەتەکین هزری یێن نهایی یێن جوراوجور | چاپا ئێکێ/٢٠١٩ | |
| | **فقهێ ئیسلامی** | | |
| | **مەوسووعەیا: خودێ پەرستیا ئیسلامی (٤ بەرگ)** | چاپا ئێکێ/٢٠٠٠<br>چاپا دوویێ/٢٠٠٩ | |
| .٤٠ | بەرگێ ئێکێ: پەرستنا خودێ ب گشتی، هویرە بابەتێن خیلافی، پاك و پاقژی | | |
| .٤١ | بەرگێ دوویێ: ئەنجامدانا نڤێژێ ئێکەمین درویشمێ خودێ پەرستیێ | | |
| .٤٢ | بەرگێ سێیێ: زەکات و دانا مالی | | |
| .٤٣ | بەرگێ چوارێ: روژی گرتن، حەج و کرنا عومرێ، کرنا زکرێ خودی | | |
| .٤٤ | بنچینەیێن گرنگێن سەرەدەریا شەرعییانە و ژیرانە دگەل هویرە بابەتێن خیلافی | چاپا ئێکێ/١٩٩٩ | ژبو زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێران |
| .٤٥ | جەژن و بیرەوەری و هەلکەفت و هەلسەنگاندنەك | چاپا ئێکێ/٢٠١٣ | |
| .٤٦ | چەند بابەتەکێن هونەری لبن روناهیا قورئان و سوننەتێ | چاپا ئێکێ/٢٠٠٩<br>چاپا دوویێ/٢٠١٥ | ژبو زمانێ فارسی هاتیە وەرگێران |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| .٤٧ | چەند بنەمایەكێن گرنگێن دانا ماڵ و سامانی د رێیا خودێ دا | چاپا ئێكێ/٢٠١٣ | |
| | تەزكییەیا نەفسێ و رەوشت | | |
| .٤٨ | بیرئینانا خودێ، گرنگیا بیرئینانا خودێ د ژیانا مروڤیدا | چاپا ئێكێ/١٩٨٧ | |
| .٤٩ | رێیا صالح بوونێ و بەرەڤ خودی چوونێ، تەزكییەیا نەفسێ لبن روناهیا قورئان و سوننەتێ | چاپا ئێكێ/١٩٩٠<br>چاپا پێنجێ/٢٠١٢ | هاتیە وەرگێڕان ژبو زمانێ عەرەبی و فارسی |
| .٥٠ | مزگەفتێن كوردستانێ دناڤبەرا ئاڤەدانكرنێ و وێرانكرنێدا | چاپا ئێكێ/١٩٩٩ | |
| .٥١ | زڤرین ژبو دەف خودێ (سبحانە وتعالی)، گوهورین بەرەڤ خودێ و، هێلانا گونەه و سەرپێچییان و، گوهورین د خو دا ژ رەهـ و ریشالان | چاپا ئێكێ/٢٠٠١<br>چاپا پێنجێ/٢٠١٠ | |
| .٥٢ | شەهید كییە و چ پلە و پایەیەك هەیە؟! | چاپا ئێكێ/٢٠٠٢ | |
| .٥٣ | بەحسەك لدور دیتنا خودایێ بلند و مەزن، ل دونیایێ و ئاخرەتێ | چاپا ئێكێ/٢٠١٥ | |
| .٥٤ | گیانێ ژیانێ باش پەرستنا خودێ و خو پاك و چاك كرن | چاپا ئێكێ/٢٠١٥ | |
| .٥٥ | مەوسووعەیا: رەوشتێن ئیسلامی لبن روناهیا قورئان و سوننەتێ | چاپا ئێكێ/٢٠١٦ | |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چـــاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| | **بانگخـوازی و کـاریَ ئیسـلامی** | | |
| .٥٦ | کوما خـــودی | چاپا ئێکیَ/١٩٨٨ | |
| .٥٧ | پێشمەرگەییَ ئیسـلامیَ، یان موسـلمانیَ موجاهد کییە و چەوایە؟ | چاپا ئێکیَ/١٩٨٨<br>چاپا سێییَ/١٩٩٨ | |
| .٥٨ | دەرد و دەرمانیَ بزاڤا ئیسـلامی | چاپا ئێکیَ/١٩٩٠ | |
| .٥٩ | بزاڤا ئیسلامی د دووریانا مان و نەمانێدا | چاپا ئێکیَ/١٩٩٣ | |
| .٦٠ | بزاڤا ئیسلامی و قویناغا نوی | چاپا ئێکیَ/ ١٩٩٤ | |
| .٦١ | چەند رێ نیشاندانەك ژبو ئیسـلامییێن کوردستانیَ | چاپا ئێکیَ/ ١٩٩٧ | |
| .٦٢ | بزاڤا ئیسلامی و ئاسویەکا گەش و روون، بنەماییێن شەرعی و بنچینەیین ئەخلاقی | چاپا ئێکیَ/ ١٩٩٧ | |
| .٦٣ | ئیسـلام و کێشـەیێن نهایی | چاپا ئێکیَ/ ١٩٩٨ | |
| .٦٤ | زانایێن ئیسـلامیَ کینە و چەوانن؟! | چاپا ئێکیَ/ ٢٠٠٢<br>چاپا سێییَ/ ٢٠١١ | هاتیە وەرگێران ژبو زمانیَ عەرەبی |
| .٦٥ | کومەلا ئیسـلامی: ئارمانج و هەلویست | چاپا ئێکیَ/ ٢٠٠٢ | |
| .٦٦ | چەوا سەرەدەرییَ دگەل خەلکی بکەین؟! | چاپا ئێکیَ/ ٢٠٠٢ | هاتیە وەرگێران ژبو زمانیَ عەرەبی |
| .٦٧ | چەوا ژ جیهادیَ تێبگەهین؟ | چاپا ئێکیَ/ ١٩٩٨ | |
| .٦٨ | جیهاد درێیا خودیَ دا و چەند سـەرنج و ئاگەهدارییەك | چاپا ئێکیَ/ ٢٠٠٢ | |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چـاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| .٦٩ | دا كو لسەر جیهادكرنێ دەیندار نەبین! | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٢ | |
| .٧٠ | جیهاد درێیا خودێ دا چییە و بوچی دهێتە كرن و چەوا دهێتە كرن؟ | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٢ | |
| .٧١ | چەند رێ نیشاندانەك ژبو خویشك و برایێن مە ل دەرڤەی وەلاتی | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٢ | |
| .٧٢ | ئیسلام و موسلمانەتی و كارێ ئیسلامی، لبن ڕوناهیا قورئان و سوننەتی | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٦ | |
| .٧٣ | هەڤپەیمانی لبن ڕوناهیا قورئان و سوننەتێ | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٩ | |
| .٧٤ | پشكداریكرن د هەلبژاردن و پەرلەمانیدا، هەلسەنگاندنەكا شەرعییانە و ژیرانە | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٩ چاپا دوویێ/ ٢٠١٣ | چاپا ئێكێ ب دوو خەلەكێن جودا جودا ب دوو ناڤ و نیشانێت جودا هاتیە كرن، ب ئەڤی شێوەیی: خەلەكا ئێكێ: بەلگەهێن ئەوان كەسێن پشكداریكرنێ د هەلبژاردن و پەرلەمانیدا ب شەرعی نزانن و هەلوەشاندنا وان خەلەكا دوویێ: بەلگەهێن دروستیا پشكداریكرنێ د هەلبژاردن و پەرلەمانیدا |
| .٧٥ | هەلوەشاندنا بیروباوەر و كریارێن توندڕەویی یێن ڕێكخراوا (داعش) | چاپا ئێكێ/ ٢٠١٥ چاپا دوویێ/٢٠١٧ | هاتیە وەرگێران ژبو زمانێ فارسی |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چـاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| ٧٦. | بلا لادان و تاوانێن توندڕەوان، مە ل بەرامبەری ئیسلامێ دوودل و ب گومان نەئێخن | چاپا ئێکێ/٢٠١٥ | هاتیە وەرگێڕان ژبو زمانێ فارسی |
| ٧٧. | توندڕەویی: پێناسەیا وێ، نیشانین توندڕەوان، ئەگەرێن توندڕەوییێ، شێنوار و دەرئەنجامێن وێ، چارەسەری | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٥ | هاتیە وەرگێڕان ژبو زمانێ فارسی |
| ٧٨. | بنەمایێن شەرعی و هێلێن گشتیین کومەلا ئیسـلامی | | |
| | **زنجیرەیا بنەمـایێن شەرعیێن کومەلا ئیسـلامی** | | |
| ٧٩. | خەلەکا ئێکێ: بەلگەهێن شەرعیین بنیاتنانا کومەلا ئیسلامی | چاپا ئێکێ/ ٢٠٠١ | |
| ٨٠. | خەلەکا دوویێ و سێیێ: حوکمێ ژ کارلادانا خەلیفە و کاربدەستێن موسلمانان لدەمێ خوار دبن و ستەمێ دکەن | چاپا ئێکێ/ ٢٠٠١ | |
| ٨١. | خەلەکا چوارێ: شێخ ئەبو بەصـیـر و هەلسەنگاندنەکا شەرعی و ژیرانەیا فەتوایێن وی | چاپا ئێکێ/ ٢٠٠١ | |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **گوتارێن كونگرەیێن كومەلا ئیسلامی كوردستان** | | |
| .٨٢ | كار و پرۆژەیێن مە یێن ئیسلامی (گوتارا كونگرەیا ئێكێ یا كومەلا ئیسلامی) | چاپا ئێكێ/٢٠٠٥<br>چاپا دوویێ/ ٢٠٠٦ | |
| .٨٣ | ڕاپورتا: ئیمانی، هزری، سیاسی یا كومەلا ئیسلامی كوردستان (گوتارا كونگرەیا دوویێ یا كومەلا ئیسلامی) | چاپا ئێكێ/٢٠١٠ | |
| .٨٤ | لێزڤڕینەك ژبو بارودوخێ ناڤخویی و واقعێ دەرەكیێ مە (گوتارا كونگرەیا سێیێ یا كومەلا ئیسلامی)،٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپا ئێكێ/٢٠١٦ | |
| | **نەتەوایەتی و مەسەلەیا كوردان** | | |
| .٨٥ | كوردستان بوچی وێران بوو و چەوا دێ ئاڤەدان بیت؟! | چاپا ئێكێ/ ١٩٨٩ | |
| .٨٦ | حوكمێ زڤڕینێ ژبو لبن چویڤێ طاغوتی ب دیتنا ئیسلامێ | چاپا ئێكێ/١٩٩٠<br>چاپا دوویێ/٢٠٠٥ | |
| .٨٧ | سوزا نەتەوایەتی و هزرا ناسیونالیزمێ د تەرازیا ئیسلامێدا | چاپا ئێكێ/١٩٩٠<br>چاپا سێیێ/٢٠٠٥<br>چاپا چواری/٢٠١٨ | |
| .٨٨ | چارەسەریا كێشەیا كوردان دناڤبەرا ئیمان و پەرلەمانیدا | چاپا ئێكێ/١٩٩٢ | |
| | **سیاسەت و حوكمڕانی** | | |
| .٨٩ | چەند بابەتەكێن سیاسی یێن هەڤچەرخ لبن ڕوناهیا عەقل و وەحییێدا | چاپا ئێكێ/ ٢٠١٠ | |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| | **مەوسووعەیا: ئیسلام و دەولەتداری، (٤ بەرگ)** | چاپا ئێکێ/ ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٩٠. | بەرگێ ئێکێ: قەوارەیا سیاسی د ئیسلامێدا: بەلگەهێن پێدڤیبوونێ، چەوانیا بنیاتنانێ، سروشت و بناغەیێ هزری، پێناسەیا چەند پەیڤ و زاراڤان | | |
| ٩١. | بەرگێ دوویێ: بنەماییێن سیستەمێ حوكمڕانییێ د ئیسلامێدا | | |
| ٩٢. | بەرگێ سێیێ: (سێ دەستهەلاتێن): یاسادانان، جێبەجێكرن، دادوەری | | |
| ٩٣. | بەرگێ چوارێ: نەموسلمان د كومەلگەهـ و دەولەتا ئیسلامیدا | | |
| ٩٤. | دیتنەكا ئیسلامییانە ژبو واقعێ مە یێ نوكە | چاپا ئێكێ/٢٠٠٩ چاپا دوویێ/٢٠١٧ | |
| ٩٥. | قورئان و پاكسازی و چاكسازی د هەرێما كوردستانێدا | چاپا ئێكێ/ ٢٠١٨ | |
| ٩٦. | گرنگیا ڕەوشتی د سیاسەتێدا | چاپا ئێكێ/ ٢٠١٩ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٩٧. | ئافرەتا موسلمانا كورد، مافێن وێ یێن شەرعی و ئەركێن وێ یێن گرنگ | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٣ چاپا دوویێ/ ٢٠٠٣ | |
| ٩٨. | مەوسووعەیا: ئافرەت و خێزان لبن سێبەرا شەریعەتی | بەرگێ ئێكێ چاپا ئێكێ/٢٠٠٢ بەرگێ ئێكێ و دوویێ چاپا سێیێ/٢٠١٣ | |
| | **دیروك** | | |
| ٩٩. | پوختەیا ژیاننامەیا پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم)، دەرس و پەندێن وی | چاپا ئێكێ/٢٠٠٩ چاپا سێیێ/٢٠١٣ | |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چـاپ | تێبـینـی |
|---|---|---|---|
| ١٠٠ | چەند قەفتەك ژ بێدەرا تەمەنێ من (بیرەوەرییێن من)، بەشێ ئێكێ (١٩٦١-١٩٩١) | چاپا ئێكێ/٢٠١٥ | |
| ١٠١ | پشتییەك ژ كاروچالاكی و رووێدانێن ژیانا من (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپا ئێكێ/٢٠١٨ | ژبو هەردوو زمانێن عەرەبی و ئینگلیزی هاتیە وەرگێڕان |
| | **دیدار و دانوستاندن** | | |
| ١٠٢ | ستوورێن قەدەغەكری نەشكێنن! (چاڤپێكەفتنا دكتورحسین محمد عزیز) | چاپا ئێكێ/٢٠٠١<br>چاپا دوویێ/٢٠٠٤ | - |
| ١٠٣ | ئەشكەنجە و زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو هەیڤان د زیندانا داگیركەراندا | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٥<br>چاپا سێیێ/ ٢٠٠٩ | هاتیە وەرگێڕان ژبو زمانێ عەرەبی و ئینگلیزی، هەروەسا دوو تەرجەمەیێن فارسی ژبو هاتینە كرن و هاتیە چاپكرن و بەلاڤكرن |
| ١٠٤ | گەنج د تێگەهێن نهاییدا | چاپا ئێكێ/٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەیا بابەتێن سەردەمی** | | |
| ١٠٥ | گەنجێن مە دناڤبەرا رەسەنایەتیێ و لاسایكرنێدا (١) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٦ | ژبو زمانێ فارسی هاتیە وەرگێڕان |
| ١٠٦ | بلا هشیار بین! هەرڤینا رەوشتی دێ كومەلگەها مە بەرەف چارەنڤیسەكێ نەیارڤە بەت (٢) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٢<br>چاپا دوویێ/ ٢٠٠٦ | |
| ١٠٧ | ب دویر ئێخستنا ئافرەتێ ژ ئیسلامێ دێ توشی چ زیانەكێ بین؟! (٣) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٧ | - |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠٨ | چەوا دێ بینە پێشەنگ و بنیاتنانا بنكەیێ جەماوەری (٤) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٧ | |
| ١٠٩ | سیاسەتا ئیسلامی و چەند روونكرنەك (٥) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٧ | |
| ١١٠ | چەند بنەمایەكێن گرنگێن گوتاربێژیێ (٦) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٦ | ژبو زمانێ فارسی هاتیە وەرگێڕان |
| ١١١ | قوتابیێن زانیاریێن شەرعی و چەند سەرنج و رێنماییەك (٧) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٧ | |
| ١١٢ | رەوشتێ بلند و پەسند پیڤەرێ موسلمانەتیێ یە (٨) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٧ | |
| ١١٣ | بانگخوازی ژبو خودێ چییە و چەوایە و ب كێ دهێتە كرن؟ (٩) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٧ | ژبو زمانێ فارسی هاتیە وەرگێڕان |
| ١١٤ | قوتابی د ئەڤی سەروبەریدا، پێدڤی یە چەوا بن و چ بكەن؟! (١٠) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٨ | |
| ١١٥ | واقعێ هەرێما كوردستانێ، دیتنەكا ئیسلامییانە (١١) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٨ | |
| ١١٦ | سروشت و ستوینێن خێزانێ و مسەلەیا چەند ژنیێ د تەرازیا شەرعی و عەقلیدا (١٢) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٩ | ئەڤ نامیلكەیە ب (١٤) خەلەكەیان د رۆژنامەیا (رۆژنامە)دا هاتیە بەلاڤكرن |
| ١١٧ | كارێ ئیسلامی و نەهێلانا چەند تاریاتییەكان (١٣) | چاپا ئێكێ/ ٢٠١١ | |
| ١١٨ | حوكمێ ڤەرڤرینێ ژ ئیسلامێ و هەڵسەنگاندنەك (١٤) | چاپا ئێكێ/ ٢٠١١ | |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١١٩ | مەلایێ مەزنێ كویە و تەفسیرا وی و چەند سەرنجەك (١٥) | چاپا ئێكێ/ ٢٠١١ | |
| ١٢٠ | ڤەكولینەك لدور: هەبوون و نەبوونا نەسخێ د قورئانێدا (١٦) | چاپا ئێكێ/ ٢٠١٢ | |
| ١٢١ | تاقیكرنا خودێ ژبو بەندەیێن وی چییە و چەوایە؟ (١٧) | چاپا ئێكێ/ ٢٠٠٣<br>چاپا دوویێ/ ٢٠١٢ | |
| ١٢٢ | ڕەهەندا كوردان ژ دەرڤەی وەلاتی و ئەركێ لسەر ملێن وان (١٨) | چاپا ئێكێ/ ٢٠١٢ | |
| ١٢٣ | خاتین مەلاژن: ئافرەتەكا هەلكەفتی و هەڤژینەكا كێم وێنە (١٩) | چاپا ئێكێ/ ٢٠١٢ | |
| ١٢٤ | گەنج و قەیرانا ڕوحی: ئەگەر، شینوار، چارەسەر (٢٠) | چاپا ئێكێ/ ٢٠١٧ | |
| ١٢٥ | ژیان لبن سێبەرا ئیمانێ و نەهێلانا گومانان (٢١) | چاپا ئێكێ/ ٢٠١٧ | |
| | **ب/پەرتووكێن عەرەبی** | | |
| | **موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله** | ط الاولى/٢٠١٥ | |
| ١٢٦ | كو د چاپا ئێكێ دا (٨) بەرگە و، د چاپا دوویێ دا ژ (١٢) پەرتووكان پێك دهێت، ب ئەڤی شێوەی: | | |
| ١٢٧ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چـاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| ١٢٨. | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٩. | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣٠. | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣١. | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣٢. | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣٣. | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٣٤. | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٣٥. | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٣٦. | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ط الثانية/٢٠١٩ | |
| ١٣٧. | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | | |
| ١٣٨. | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چـاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| ١٣٩ | نقض فـكـرة التطـرف | ط الاولى/٢٠١٦- لندن، ط الثانية/ ٢٠١٧، - القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | |
| ١٤٠ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنـاة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | - |
| ١٤١ | لقاء خاص (مقابلـة مع قنـاة العـالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٤٢ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى /٢٠١٦ | |
| ١٤٣ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| ١٤٤ | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩ ط الثاني/٢٠١٣ | |
| ١٤٥ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٤٦ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| ١٤٧ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الاولى/ ٢٠٠٥ ط الثانية/ ٢٠١٨ | |
| ١٤٨ | الأصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١ ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| ١٤٩ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٥٠ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى والثانية/٢٠١٨ | |

| ژ | پەرتووك | بەروار و چـاپ | تێـبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| ١٥١ | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى /٢٠١٧ | |
| ١٥٢ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| | ئەو پەرتووكێن لبن چاپكرنێ | | |
| ١٥٣ | تەفسـيـرا قورئانا بلند و پیروز، بەرگێ دوازدێ: سـوورەتێن: (الرعد، إبراهيم، الحجر) | | |
| ١٥٤ | گەشبوونا ئیمانێ و پویچاتیا ئیلحادێ، لبن ڕوناهیا زكماك و عەقل و زانست و وەحییێدا | | |
| ١٥٥ | دوبارە بەرێخودانەك ژبو كارێ ئیسلامی | | |
| ١٥٦ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | | |
| ١٥٧ | واقعێ دژوارێ ئوممەتێ: ئەگەر و چارەسەر | | |

## ناڤەرۆك



## بەشێ ئێکێ
## سیکولاریزم
*(SECULARISM)*

## بەشێ دوویێ
## دیموکراسی
## (*DEMOCRACY*)



## بەشێ سێیێ
## ئەنجامێن: سیکولاریزم و دیموکراسیێ د ئەزموونا هەرێما کوردستانێدا

## بەشێ چوارێ
## بەرسڤدانا پرسیاران



## بەشێ پێنجێ
## بەرسڤا چەند ئاخفتنەكان كو د دیبەیتێ دا نەگەهشتم بەرسڤا وان بدەم

## كورتييەك ژ ديروكا ژيانا ماموستا عەلی باپیر



- ناڤ: عەلی باپیر وەتمان.
ژدایکبوویێ: سالا (١٩٦١ز) ل قەزایا پشدەر سەر ب پارێزگەها سلێمانییێ.
- زانیارییێن ئیسلامی ل پەیمانگەها ئیسلامی (ڕانیە و سلێمانی) و لدەف زانایێن کوردستانێ و عیراقێ و "پاشان یێن کوردستانا ئیرانێ" بدەستڤە ئینانینە، ل سالا (١٩٨٠ز) قورئانا پیروز ژبەرکریە.
- ل سالا (١٩٨١ز) ژلایێ ڕژێما بەعس بڕیارا دەستگیرکرنێ ژبو هاتیە دان، لەوما هەر ل وی دەمی عیراق بجهـ هێلایە و ئاوارە بوویە ل ئیرانێ، کو ل وی دەمی ل قویناغا دوویێ یا زانکویێ بوو، کولیژا شەریعەت.
- ل سالا (١٩٨٣ز) زڤریە کوردستانا عیراقێ و ل ڕێڤەبەریا ئەوقافا هەولێرێ تاقیکرنا ئیمامەتیێ کریە و، ل مزگەفتا (نورسی) ل بازێرێ ڕانیە هاتیە دامەزراندن و، بەردەوام بوویە لسەر گوتنا وانەیان و بانگخوازیا ئیسلامێ و ...هتد.

- ئێكەمين بەرهەمێ خو ل سالا: (١٩٨٣ز) نڤيسيه بناڤێ: (پوختەيەك لدور ئيسلامێ)، پاشان پەرتووك و بەرهەمێن وى د بەردەوام بوون كو د نوكەدا ژمارەيا وان ژ سەد (١٠٠) بەرهەمان پترە، كو ژ مەوسووعە و پەرتووك و ناميلكەيان پێك دهێن و، ب زمانێن كوردى و عەرەبى هاتينە نڤيسين و، هندەك ژ پەرتووكێن وى كو ب زمانێ كوردى هاتينە نڤيسين ژبو زمانێن: عەرەبى و، فارسى و، توركى و، ئينگليزى ژى، هاتينە وەرگێڕان.
- ل سالا (١٩٨٧ز) پشتى چەند سالان ژ خەباتا ئاشكەرا و نهێنى دگەل {بزاڤا پەيوەنديا ئيسلامى}، كو ل دوماهيا سالێن حەفتێيێ ژ چەرخێ بورى ڕێكخستنێن وێ يێن نهێنى دامەزراندن،چوويە چيايى و دەست ب خەباتا چەكدارى كريە د چوارچوڤەيا بزاڤا ئيسلاميدا، كو ل چەند دەڤەرێن كوردستانێ بنكە و بارەگايێن سەربازى هەبوون لدژى ڕژێما بەعس و، هێزا حەمزە ل بناڤا چيايێ قەنديل دامەزراند.
- ل سالا (١٩٨٨ز) بوويە ئەندامێ مەكتەبا سياسى يا بزاڤا ئيسلامى.
- ل سالا (١٩٩١ز) ڕولەكێ مەزن هەبوويە د سەرهلدانا ئادارا (١٩٩١ز) و هشياركرنا خەلكێ كوردستانێ، ژ مەرەم و ئارمانجێن سەرهلدانا جەماوەرى و دانەنياسينا بزاڤا ئيسلامى.
- هەتا سالا (٢٠٠١ز) دناڤ بزاڤێدا بەردەوامى دايە خەباتا خو و، د هەمان سالێدا دگەل پتريا هێز و مەلبەندێن بزاڤا ئيسلامى، ژبەر چەند ئەگەرەكێن مەنهەجى (كومەلا ئيسلامى كوردستان) ڕاگەهاند و ب ئەميرێ كومەلا ئيسلامى هاتە هەلبژاردن.
- ل (٢٠٠٣/٧/١٠ز) ل سنوورێ سلێمانيێ ژلايێ هێزێن ئەمريكى ب تومەتێن نەدروست هاتە دەستگيركرن، ژبو ماوەيێ (٢٢) هەيڤان د زيندانێدا مايە و، هەر د زيندانێدا مەوسووعەيا: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) د

دوازدە پەرتووك و چوار هزار (٤٠٠٠) لاپەڕەیاندا نڤیسیە و، ل (٢٠٠٥/٤/٢٨ز) ژ زیندانێ ڕزگار بوویە.

- هەتا نوکە پتر ژ (١٠٠) پەرتووك و نامیلکە نڤیسینە د بوارێن: هزرا ئیسلامی و عەقیدە و فقهـ و حوکم و سیاسەت و تەزکیەیا نەفسێ و ڕەوشتی و، بەرسڤدانا هزر و کورەڕێکێن نامو و ... هتد.
- د هەلبژاردنێن سالا (٢٠١٠ – ٢٠١٤ز)، ژبو جڤاتا نوینەرێن عیراقێ ل بازنەیا پارێزگەها هەولێرێ کاندید بوویە و، دەنگێ ئێکێ بدەست خوڤە ئینایە، پتر ژ (٦٠,٠٠٠) دەنگان.
- کومەلا ئیسلامی هەتا نوکە سێ کونگرە گرێدایبنە، ل سالێن: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز) و د هەمییاندا، ب ئەمیر هاتیە هەلبژاردن.
- نوکە پروژەیێ تەفسیرکرنا قورئانا بلند و پیروز دەستپێکریە و، هەتا نوکە چەندین بەرگ ژێ هاتینە چاپ کرن و بەلاڤ کرن.

ژبو پتر پێزانینان لسەر ژیانا نڤیسەری، سەرەدانا مالپەرێ وی یێ تایبەت بکەن: www.alibapir.net

ئەڤ پەرتووکە ..

دەقێ ئەوێ گوتوبێژێ یە

کو لبن ناڤ و نیشانێ:

(سیکولاریزم و دیموکراسی

د ئەزموونا کوردستانێدا)

ل ڕوژا (٢٠١٦/٦/١٠) ل سلێمانیێ

ل هولا تەوار،

دناڤبەرا بەندەی و

کاك مەلا بەختیاری دا



هاتیە ئەنجام دان.

هەلبەت پشتی پێداچوون و

زێدەکرنا هندەك بەحس و بابەتان،

کو د دەستپێکا پەرتووکێدا ئاماژە

پێ هاتیە دان.